

# پڕۆژەی

# ژیاننامەی پێغەمبەران



اللهم جدد الإيمان في قلبي

٢٠٢٣ز - ١٤٤٥ك

# چیرۆکی یەکەم
## دەرکەوتنی ئادەم

-سەلامی خوای گەورەی لێ بێت- سەرەتا خوای گەورە بە فریشتەکانی ڕاگەیاند کەوا ئادەم و نەوەکانی لەسەر زەویدا بەدی دەهێنێ و بەدەسەڵات و بەتواناش ئەبن؛ هەروەها کۆشش ئەکەن و لە خێروبێری ناو زەوی دەرئەهێنن و بە هەموو شوێنێکی زەویدا بڵاو دەبنەوە. خوای گەورە فریشتەکانی بۆ خواپەرستی لەپێش ئادەم بەدی هێناوە و لە گوناهـ و تاوان و سەرپێچی پاراستوونی. هەروەها بەخشش و خۆشەویستیی زۆری پێ بەخشیون، پشتیوانی و ڕێنمونیشی بۆ فەرمانبەریکردنی خۆی کردوون. بەڵام لەبەر ئەوەی خوای گەورە ئادەم و نەوەکانی لە هەڵە و گوناهە نەپاراستووە، بۆیە فریشتەکان ترسان لەوەی وەك چۆن خۆیان ئاسمانیان بە خواپەرستی و بەزەیی و خاوێنی ئاوادان کردۆتەوە، نەوەکانی ئادەم سەرپێچی و کەموکورتی بکەن و نەتوانن وەك فریشتەکان سەرزەوی بە خواپەرستی ئاوەدان بکەنەوە.

فریشتەکان وایان ئەزانی خۆیان لە نەوەی ئادەم باشترن، بۆیە لە لای خوای گەورە پاکانەی خۆیان کرد و بە خوای گەورەیان وت: چۆن کەسی تر دروست ئەکەی لەکاتێکدا ئێمە بەدڵسۆزییەوە پاکی و بێگەردیت بۆ دائەنێین و سوپاست ئەکەین و ناوت بەپیرۆز ڕائەگرین، کەچی ئەوانەی سەر زەوی بەتاوانکردن سەرزەوی خراپ ئەکەن و بەهۆی سوود و قازانجی دنیاوە جیاوازی ئەکەوێتە نێوانیان و ئەوکاتەش خوێنی زۆر دەڕێژن و گیانی پاك و بێتاوان ئەکوژن؟!
پلەوپایەی ئادەم -سەلامی خوای گەورەی لێ بێت- خوای گەورەش وەڵامی فریشتەکانی دایەوەو دڵ ئارامی کردنەوەو فریشتەکانی تێگەیاند؛ کە خوای گەورە ڕێزێکی زۆری لە نەوەی ئادەم گرتووە و بەدەستی خۆی ئادەمی دروست کردووەو لە گیانی خۆی گیانی پێداکردووە... ڕاستەوخۆش خوای گەورە ئادەمی فێری ناوەکان و زانیارییە پێویستییەکان کردووە بەجۆرێك هەتا ئامادەییان هەبێ لە ڕاستییەکان و سوننەتەکانی خوای گەورەو لە یاساکانی ناو گەردوون تێبگەن، بەمەش ئەتوانن لەسەر زەوی دەسەڵات پەیدابکەن و زەوی نۆژە ن و ئاوە دان بکە نە وە

## چیرۆکی دووه م
## ئیدریس علیه السلام

خودای گەورە دەفەرموێ: {{وَإِسْمَاعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا الْكِفْلِ كُلٌّ مِّنَ الصَّابِرِينَ ﴿٨٥﴾ وَأَدْخَلْنَاهُمْ فِي رَحْمَتِنَا إِنَّهُم مِّنَ الصَّالِحِينَ ﴿٨٦﴾}}. ألأنبياء.
واتە: یادی (اسماعیل و ادریس وذَوالکفل)یش بکەرەوە، هەریەکە لەوان (لە تاقیکردنەوەی جۆرا و جۆرەکاندا سەرکەوتووبوون) لە خۆگر و ئارامگران بوون. ئێمە هەموویانمان خستە ژێر سایەی ڕەحمەت و میهرەبانی خۆمانەوە، چونکە بەڕاستی ئەوانە لە چاک و پاکانن.
هەروەهاخودای گەورە لە سورەتی (مریم)دا دەفەرموێ: {{وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِدْرِيسَ إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ﴿٥٦﴾ وَرَفَعْنَاهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴿٥٧﴾}}.مریم.
واتە: هەروەها لەقورئاندا باسی ئیدریس بکە، چونکە ئەویش پێغەمبەرێکی زۆر ڕاستکار و ڕاستگۆ بوو، بۆیە ڕێزی زۆرمان لێگرت و پایەدار و بەرز و بڵندمان کرد لەجێگە و ڕێگەی تایبەتدا.
لە (صەحیحی بوخاری)دا هاتووە: پێغەمبەری مەزن() لەشەوی (ئیسرا و میعراج)دا و لەئاسمانی چوارەم چاوی کەوتووە بە ئیدریس و سەلامی لێ کردووە: ((..فأتيتُ على إدريس فسلَّمتُ، فقالَ: مَرحباً بكَ من أخٍ ونبيّ)).

واتە: هاتم بۆلای ئیدریس و سەلامم کرد ئەویش وەڵامی دایەوە گوتی بە خێربێیت ئە ی براو پێغە مبە ر.نە وە ی ئادە م لەدوای ئادەم خوای گەورە نەوەی ئادەمی زۆر کرد و بە ناوچەکاندا بڵاوەی پێ کردن و ماڵ و دێهاتی زۆریان دروست کرد... زەوییان دەکێڵا و کشتوکاڵیان دەکرد و لەسەری دەژیان... خوای گەورەشیان دەپەرست و هاوبەشییان بۆ پەیدا نەدەکرد... نەوەی ئادەم هەموو وەك یەك نەتەوەبوون... باوکیان ئادەم بوو... (اللّه) ش خوای گەورەیان بوو...
بەڵام شەیتان حەز دەکات تۆڵەی خۆی لە ئادەم و نەوەی ئادەم بسەنێ؛ چونکە کاتێك شەیتان کڕنووشی بۆ ئادەم نەبرد، خوای گەورە لە بەهەشت دەری کرد؛ بۆیە شەیتان بانگەوازی بۆ بێباوەڕی و گومڕایی دەستپێکردو خەڵکی لە خوا پەرستی دوور خستەوە، بۆ ئەوەی ئەوانیش وەك خۆی بچنە دۆزەخ و نەچنە بەهەشتەوە...
ئادەمیزاد یان فریشتە
خوای گەورە ویستی وابوو پەیامبەرێك لە ئادەمیزاد بۆ نەوەی ئادەم بنێرێ، قسەیان لەگەڵدا بکات و ئامۆژگارییان بکات،

چونکە خوای گەورە یەکە یەکە قسە لەگەڵ
هەموو خەڵك ناکات، لەبەرئەوە خوای گەورە لە
ئادەمیزاد خۆیان یەکێکی بۆ ناردن تا خەڵکی
بیناسن و لە قسەکانی تێبگەن. ـ چونکە ئەگەر
پێغەمبەر فریشتە بووایە خەڵکی دەیان وت: ئێمە
ناتوانین وەك ئەو بکەین، ئەو فریشتەیەو ئێمە
ئادەمیزادین..ئە خۆین و ئە خۆینە وە،ماڵ و
منالمان
هە یە ،چۆن خوداپەرستی بکەین؟
بەڵام ئەگەر پێغەمبەر ئادەمیزاد بێ پێیان ئەڵێ:
خۆ منیش وەك ئێوە دەخۆم و دەخۆمەوە، ماڵ و
منالّیشم هەیە، خوای گەورەش دەپەرستم، ئیتر
ئێوە بۆچی ناپەرستن..؟ ـ ئەگەر پێغەمبەر
فریشتە بووایە خەڵکی دەیان وت: فریشتە برسی
و تینووی نابێ، نەخۆش ناکەوێ و نامرێ،
گیروگرفتی ژیانی نییەو خوای گەورە لە یاد
ناکات، لەبەرئەوە ئەتوانێ خوا پەرستی بکات..!
بەڵام ئێمە برسی و تینوومان ئەبێ و نەخۆش
ئەکەوین و ئەمرین، گیروگرفتی ژیانمان هەیەو لە
خوای گەورە بێئاگا دەبین، ئیتر چۆن ئەتوانین
خواپەرستی بکەین و هەمیشە لە یادمان نەچێت؟

بەڵام ئەگەر پێغەمبەر ئادەمیزاد بێ پێیان ئەڵێ:
خۆ منیش وەك ئێوە برسی و تینووم ئەبێ،
نەخۆش دەکەوم و ئەشمرم، لە ژیانیشدا
گیروگرفتم تووش ئەبێ، خوای گەورەش
ئەپەرستم و هەمیشە لە یادیشمەو لێی بێ ئاگا
نابم، ئیتر ئێوە بۆچی خوای گەورە نا پەرستن؟
ئیدریس پێغەمبەری خوایە لەدوای ئادەم و(شیث)
خوای گەورە پیاوێکی بەناوی ئیدریس هەڵبژاردو
کردی بە یەکەم پێغەمبەرو بۆ نەوەی ئادەمی نارد،
تا واز لە گومڕایی بێنن و بۆ خواپەرستی
ڕاستەقینە بگەڕێنەوە... ئیدریس(سەلامی خوای
گەورەی لێ بێت) پیاوێکی بە ئارام و ڕاستگۆو
زۆر بەڕێزی نەوەی ئادەم بوو، لە بنەماڵەیەکی
ناودار بوو، (شیث) کە کوڕی ئادەمە باپیری باپیری
ئیدریسیش بووەو لە دوای وەفاتی ئادەم کاروبارو
ڕێنوومایيەکانی شەریعەتی ئادەمی بەڕێوە
بردووە، ئیدریس(سەلامی خوای گەورەی لێ بێت)
لە شاری بابل لە دایك بووەو لەوێش گەورە بووە،
هەر لە منالیشەوە زانیارییەکانی شەریعەتی ئادەم
و ئامۆژگارییەکانی( شیث)ی وەرگرتووەو لێیان
تێگەیشتووە،

کاتێکیش گەورە بوو خوای گەورە بەخششی پێغەمبەرایەتی پێداو ناردی بۆ سەر نەوەی ئادەم، تا واز لە هاوەڵ بۆ خوا پەیداکردن بهێنن و بۆ لای خوای گەورە بگەڕێنەوە و لەسەر شەریعەتی ئادەم و پیاوچاکانی پێشینە خواپەرستی بکەن... بەڵام کەمێك لە نەوەی ئادەم گوێڕایەڵییان کرد، خراپەکارانیش ئامۆژگارییەکانیان نەبیست و لەسەر لاری خۆیان بەردەوام بوون... بۆیە ئیدریس و باوەڕدارانی هاوەڵی ئەو شارەیان جێهێشت و بەرەو میسر کۆچیان کرد.

بانگەوازی ئیدریس

شەیتان وازی لە نەوەی ئادەم نەهێناو خراپەکارانیش بە قسەیان کردو لەسەر بێباوەڕی و هاوەڵ بۆ خوا پەیداکردن بەردەوام بوون و وایان ئەزانی ئەوە ئایینی ڕاستەو لە باووباپیرانیانەوە بۆیان ماوەتەوە... لەبەرئەوە ئیدریس(سەلامی خوای گەورەی لێ بێت) سەر لە نوێ بانگەوازی نەوەی ئادەمی بۆ ئایینی ڕاستی خوای گەورەو یەکتاپەرستیو خواپەرستی کردەوە، تا لە دونیادا بە کردەوەی چاکەوە خۆیان خەریك بکەن و لە دواڕۆژیشدا لە سزای خودای گە ورە رزگاریان ببێت

## چیرۆکی سێیه م
## چیرۆکی نوح///

خودای گەورە لەسورەتی (نوح)دا دەفەرموێ:
{{إِنَّا أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١﴾ قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ﴿٣﴾ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى إِنَّ أَجَلَ اللَّهِ إِذَا جَاءَ لَا يُؤَخَّرُ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤﴾}}.
واتە: بەڕاستی ئێمە نوح مان ڕەوانە کرد بۆلای قەومەکەی، فەرمانمان پێ کرد کەقەومەکەت بێدار بکەرەوە پێش ئەوەی سزایەکی بە ئێش یەخەیان پێ بگرێت. ئەویش گوتی: ئەی قەوم و هۆز و گەلم من بێگومان بێدارکەرەوەیەکی ئاشکرام بۆتان. داواتان لێ دەکەم کە: هەر خودا بپەرستن و لەخەشم و قینی، خۆتان بپارێزن و فەرمانبەرداری منیش بن. ئەوکاتە خودا لەگوناهەکانتان خۆش دەبێت و دەتانهێڵێتەوە بۆکاتێکی دیاری کراو، بێگومان کاتی دیاری کراوی خودا وەختێک پێش دێت، بەهیچ شیوەیەک دواناکەوێت ئەگەر بتانزانیایە.

خودای گەورە بەپەیامێکی ئیلاهی ی خۆیەوە (نوح)ی ڕەوانە کرد بۆگەلەکەی بۆ ئەوەی بێداریان بکاتەوە و بانگیان بکات بۆ پەرستنی خودای گەورە و واز لە بت پەرستی بهێنن. خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا ناوی ئەو پێنج بتانەشی هێناوە کە گەلەکەی (نوح) دەیانپەرست، ئەویش لەسەر زاری گەورە و پیاوماقوڵانیانەوە کە دەیان گوت:
{{وَقَالُوا لَا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا ﴿٢٣﴾}}. واتە: گوتیان خەڵکینە: نەکەن واز لەخوداکانتان بهێنن!! نەکەن واز لە (وود و یَەغُوثَ و یەعوق و نەسر) بهێنن.
(نوح) ماوەیەکی زۆر لەناو گەلەکەی ماوەتەوە وبەردەوام بانگەوازی لەگەڵ کردوون و ئامۆژگاری کردوون و داوای لێ کردوون کەدەست بەرداری بت پەرستن ببن و ڕوو لەخودا بکەن. لەم بارەیەوە خودای گەورە ماوە زەمەنی یەکەی دیاری کردووە و دەفەرموێ:
{{وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ الطُّوفَانُ وَهُمْ ظَالِمُونَ ﴿١٤﴾}}.ألعنكبوت.

واتە: بێگومان ئێمە (نوح) مان ڕەوانە کرد بۆ لای قەوم و هۆزەکەی، هەزار ساڵ پەنجا کەم لەناویاندا مایەوە (نۆسەد و پەنجا ساڵ)، سەرئەنجام لافاو و زریان هەموویانی پێچایەوە لەکاتێکدا ئەوان ستەمکار بوون.
بەڵام قەومەکەی (نوح) زۆر سەرسەخت و کەللە ڕەق و نەفام بوون، نەک هەر بەدەم ئامۆژگاری یەکەیەوە نەدەچوون، بەڵکو ئینکاری ئەوەیان دەکرد کەئەو پێغەمبەر بێت و نیرراوی خودای گەورە بێت بۆلای ئەوان چونکە:
١ ـ "لەدید و بۆچوونی ئەو قەومەی (نوح)" نابێت پێغەمبەر مرۆڤێک بێت وەک ئەوان، بەڵکو دەبێ مەلائیکەت بێت نەک لەڕەگەزی بەشەر بێت.
٢ ـ ئەوانەی کەباوەڕیان پێ هێنابوو و دوای کەوتبوون لەهەژار و بێکەس و چەوساوان بوون، بەڕای ئەو قەومە ئەوجۆرە کەسانە بەبێ تێفکرین دوای کەوتوون. هەتا گەیشتە ڕادەی ئەوەی کە بەتۆمەتی درۆکردن (نوح) و باوەڕداران خەتابار بکەن:
{{فَقَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قِوْمِهِ مَا نَرَاكَ إِلاَّ بَشَرًا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إِلاَّ الَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ الرَّأْيِ وَمَا نَرَى لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَاذِبِينَ ۝{٢٧}}}. هود.

واتە: جا ئەو دەستە دەسەڵاتدارەی کە بێ باوەڕ بوون لەهۆزی نوح گوتیان: ئێمە تۆ تەنها وەک یەکێک لەخۆمان دەبینین و نابینین ئەوانەی شوێنی تۆ کەوتوون جگە لەوانەی کەهەژار و داماوەکانمانن و دووربین نین، ژیرییان کەمە و سادەن. هەروەها نابینین ئێوە هیچ شتیکی زیاترتان بەسەر ئێمەوە هەبێت، بەڵکو ئێمە وا گومان دەبەین ئێوە درۆزنن.

(نوح) بەهیچ شیوەیەک کۆڵی نەدا لە ئامۆژگاری کردنی قەومەکەی بەڵام بێ سوود بوو، تەنها کەسانێکی کەم بڕوایان پی هێنا ئەوانەش هەژار و چەوساوەکان بوون کە باسمان لێ کرد.

لەقورئانی پیرۆزدا خودای گەورە وێنەی خۆ بەگەورە زانین و لووت بەرزی ئەو گەلە لەو بەتەنگە نەهاتنی (نوح) مان پێشان دەدات و ڕوخساری دزێوی گومڕاییشیان دەردەخات هەروەها وێنەی (نوح)یشمان وا پێشان دەدات کە پیاوێکی بەئارام و بەسۆزە و هەوڵ دەدات ئەو بۆچوونە هەڵەیە لە مێشکیان دەربێنێت:

{{قَالَ الْمَلأُ مِن قَوْمِهِ إِنَّا لَنَرَاكَ فِي ضَلاَلٍ مُّبِينٍ ۝{٦٠} قَالَ يَا قَوْمِ لَيْسَ بِي ضَلاَلَةٌ وَلَكِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ ۝{٦١} أُبَلِّغُكُمْ رِسَالاَتِ رَبِّي وَأَنصَحُ لَكُمْ وَأَعْلَمُ مِنَ اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ ۝{٦٢} أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَاءكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَى رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ وَلِتَتَّقُواْ وَلَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ۝{٦٣}}}. الأعراف

واتە: دەستەی دەسەڵاتداری قەومەکەی گوتیان: بەڕاستی ئێمە تۆ لەنێو گومڕاییەکی ئاشکرادا دەبینین!! (نوح) گوتی: ئەی قەوم و هۆزم من هیچ گومڕاییەکم نی یە بەڵکو من پێغەمبەرێکم و لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە ڕەوانە کراوم، پەیامەکانی پەروەردگارمتان پێ ڕادەگەیەنم، من دڵسۆزیتان لەگەڵ دەکەم، ئەوەی من دەیزانم دەربارەی گەورەیی و باڵادەستی خودا، ئێوە نایزانن. ئایا ئیوە سەرسام بوون لەهاتنی بەرنامە و یادخەرەوەیەک لەلایەن پەروەردگارتانەوە، بۆ سەر پیاوێکی (ڕاستگۆ) لەخۆتان؟ تابێدارتان بکاتەوە و دینداری و خوداناسی بکەن، بۆئەوەی سەرئەنجام ڕەحمتان پێ بکرێت.ئیتر کە دیتیان (نوح) واز ناهینیت لەبانگەوازەکەی و داوایان لێ
دەکاتکەدوور کەونەوە لە پەرستنی ئەو بتانە و ئیمان بە خودای گەورە بهێنن، هەروەها کە دیتیان

شوێنکەوتوانی ئەو لەهەژارانن و بێ دەسەڵاتانن و لەنێوان ئەمان و ئەوان چەندین جیاوازی دارایی و کۆمەڵایەتی هەیە، بۆیە مەرجێکی گرانیان لەسەر (نوح) دانا کە (بۆ ئەوەی باوەڕی پێ بهێنن، دەبێت ئەو هەژار و بێ دەسەڵاتانە لەخۆی دوورخاتەوە و لەدینەکەش دەریان بکات). خودای گەورە لە سورەتی (هود)دا دەفەرموێ:

{{قَالَ يَا قَوْمِ أَرَأَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَى بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّيَ وَآتَانِي رَحْمَةً مِّنْ عِندِهِ فَعُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ أَنُلْزِمُكُمُوهَا وَأَنتُمْ لَهَا كَارِهُونَ ﴿٢٨﴾ وَيَا قَوْمِ لا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مَالاً إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى اللّهِ وَمَآ أَنَاْ بِطَارِدِ الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّهُم مُّلاَقُو رَبِّهِمْ وَلَكِنِّيَ أَرَاكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ ﴿٢٩﴾ وَيَا قَوْمِ مَن يَنصُرُنِي مِنَ اللّهِ إِن طَرَدتُّهُمْ أَفَلاَ تَذَكَّرُونَ ﴿٣٠﴾ وَلاَ أَقُولُ لَكُمْ عِندِي خَزَآئِنُ اللّهِ وَلاَ أَعْلَمُ الْغَيْبَ وَلاَ أَقُولُ إِنِّي مَلَكٌ وَلاَ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزْدَرِي أَعْيُنُكُمْ لَن يُؤْتِيَهُمُ اللّهُ خَيْرًا اللّهُ أَعْلَمُ بِمَا فِي أَنفُسِهِمْ إِنِّي إِذًا لَّمِنَ الظَّالِمِينَ ﴿٣١﴾}}

واتە: نوح گوتی: ئەی خزمەکانم هەواڵم بدەنێ: ئەگەر من لەسەر ڕێگەیەکی ڕاست و دروستبم لەلایەن پەروەردگارمەوە و خێر و چاکەو بەزەیی خۆی پێ بەخشیبم لەلایەن خۆیەوە، بەڵام ئەوە لەئێوە شاردرابێتەوە، ئایا بەزۆر پابەندتان بکەین پێ یەوە لەکاتێکدا ئێوە حەزی لێ ناکەن و لێ ی بێزارن؟.

ئەی خزمەکانم (خۆ من) لەبری ئەو بانگەواز و ئامۆژگاری یانەم داوای هیچ ماڵ و خەرجیتان لێ ناکەم، کرێ و پاداشتم تەنها لای خودایە، من هەرگیز ئەوانەی بڕوایان هێناوە لەخوم دوور ناخەمەوە و دەریان ناکەم، چونکە ئەوان بەدیداری خودای خۆیان دەگەن (لەڕۆژی دواییدا) وحیسابیان لای خودایە، بەڵام بەڕاستی من ئێوە دەبینم هۆزێکن خۆتان گێل و نەفام دەکەن (بەوەی بەکەم سەیری ئیماندارانی دەوری من دەکەن لەبەر بێ کەسیی و هەژارییان).
ئەی خزمەکانم کێ دەتوانێت یارمەتیم بدات بەرامبەر خودای گەورە (لە سزای خودا بمپارێزێت) ئەگەر ئەو ئیماندار و دۆستانەی خودا دەربکەم و لەخۆمیان دوور بخەمەوە و ئایا بیرناکەنەوە ( کە شتی وانابێت و دروست نی یە بۆکەسێک خودا ناس بێت)؟. خۆ من پێتان ناڵێم گەنجینەکانی خودا لای منە، وناشلێم غەیب و نادیارەکان دەزانم هەروەها ناڵێم من فریشتەم، بەوانەش ناڵێم کەلەبەر چاوی ئێوە سووک و بێ ڕێزن خودا هێچ خێریان بەسەردا ناڕژێنێت، خودا خۆی ئاگادارە بەوەی لەدەروونی ئەواندا هەیە، بێگومان من ئەو کاتە لەستەمکاران دەبم (ئەگەر ئەو هەژارانە دەربکەم).

قسەکانی (نوح) کاریگەری لەسەر دەروونی قەومەکەی نەبوو، بەڵکو بەوپەڕی سەرکێشی و بەربەرەکانی یەوە ڕەدیان دایەوە. خودای گەورە دەفەرموێ:
{{قَالُواْ يَا نُوحُ قَدْ جَادَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَالَنَا فَأْتَنِا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ إِنَّمَا يَأْتِيكُم بِهِ اللّهُ إِن شَاء وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٣٣﴾وَلاَ يَنفَعُكُمْ نُصْحِي إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ اللّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٣٤﴾}}. هود
واتە: (خەڵکەکە) گوتیان: ئەی نوح بەڕاستی زۆر لەسەری چوویت و زیاد لەپێویست بەربەرەکانی و شەڕەقسەت لەگەڵدا کردین، دەی ئەو سزایەمان بۆ بهێنە کەهەڕەشەی پێ دەکەیت و هەمیشە باسی دەکەیت و دەمانترسێنی پێی، ئەگەر تۆ لەڕاستگۆیانیت. (نوح) لەوەڵامدا گوتی: ئەوە بەدەست خودایە، و بەڕاستی تەنها ئەو بۆتان پێش دەهێنێت و ئێوە ناتوانن (لەسزای خودا) دەرباز بن. (وادیارە) ئامۆژگاری و دڵسۆزیم بۆتان سوودتان پێ ناگەیەنێت ئەگەرچی بمەوێت بەردەوامیشبم لەسەر ئامۆژگاریتان، ئەگەر خودا بیەوێت سەرگەردانتان بکات، ئەو پەروەردگانتانە هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێنەوە .

دوای سەدەها ساڵ بانگەواز، (نوح) پەنای بردە لای پەروەردگار وداوای لێ کرت کە فریای بکەوێت لە و ئەزیەت و ئازارانەی کە دەیچێژێت بەدەست گەلەکەیەوە، خودای گەورە دەفەرموێ:
{{قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا ﴿٥﴾ فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَائِي إِلَّا فِرَارًا ﴿٦﴾ وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوا أَصَابِعَهُمْ فِي آذَانِهِمْ وَاسْتَغْشَوْا ثِيَابَهُمْ وَأَصَرُّوا وَاسْتَكْبَرُوا اسْتِكْبَارًا ﴿٧﴾ ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا ﴿٨﴾ ثُمَّ إِنِّي أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا ﴿٩﴾ فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَارًا ﴿١٢﴾}}.نوح
واتە: ئەی پەروەردگارم من بە شەوو بەڕۆژ بانگی قەوم و گەلەکەمم کرد بۆ (بڕوا هێنان). وەتا بانگم دەکردن ئەوان زۆرتر دوور دەکەوتنەوە لێم.وەبێگومان من هەرکات بانگم دەکردن (بۆ بڕواهێنان) تا لێیان خۆش ببیت، ئەوان پەنجەیان دەخستە گوێچکەیانەوە تا نەبیستن، وەجلەکانیان دەدا بەسەر وچاویاندا تا نەمبینن،زۆر گەرم بوون لەسەر بێبارەڕی و سەرکێشیان دەکرد، چۆن سەرکیشی یەک، لەپاشان بەئاشکرا بانگم کردن و (تارم بۆ دان).

ئینجا من بەڕوونی و بەبێ پەردە هەموو شتێکم بۆ باس کردن، هەندێ جاریش بەنهێنی قسەم بۆدەکردن (بۆ تاکە تاکە و خێزانەکانیان).
بەردەوام پێم دەگوتن داوای لێخۆشبوون لەپەروەردگارتان بکەن چونکە بەڕاستی پەروەردگارتان زۆر لێخۆشبووە. بارانتان بەلیزمە و خوڕەم بۆدەبارێنێت. مال و سامان و نەوەتان پێ دەبەخشێت، وەباخ و باخاتی زۆرتان دەداتێ، ڕووبار و چەم و جۆگەتان بۆبەدی دێنێت.
لەپاشان (نوح) هەولی ئەوە دەدات بو سەرنج ڕاکێشانیان بەلای قودرەت و تواناو نیعمەتەکانی خودا بەڵکو بەوەیان باوەڕ بێنن، خودای گەورە دەفەرموێ:
{{مَّالَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴿١٣﴾ وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴿١٤﴾ أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا ﴿١٥﴾ وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا ﴿١٦﴾ وَاللَّهُ أَنبَتَكُم مِّنَ الْأَرْضِ نَبَاتًا ﴿١٧﴾ ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا ﴿١٨﴾ وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ بِسَاطًا ﴿١٩﴾ لِتَسْلُكُوا مِنْهَا سُبُلًا فِجَاجًا ﴿٢٠﴾}}. نوح.

واتە: ئەوە چیتانە ئێوە قەدری خودا نازانن، بۆڕێزی بۆ دانانێن و لێی ناترسن. خۆ ئێوە پێشتر نەبوون؛ هەر خودا خۆی بەچەند قۆناغدا ئێوەی تێپەڕاند و دروستی کردن. ئایا سەرنجتان نەداوە چۆن خودا حەوت چینی ئاسمانی دروست کردووە؟ مانگی گێڕاوە لەناویاندا بەڕووناک و ڕۆژیشی گیڕاوە بەچرا. هەر خودا خۆی ئێوەی لەخاکی زەوی بەدیهێناوە و پێی گەیاندوون. پاشان دەتانمرێنێت و دەتان باتەوە ناوی، هەرکاتیش بیەوێت دەرتان دەهێنێتەوە. هەر ئەو خودایە زەوی بۆڕاخستوون تا (بە ئارەزووی خۆتان) هاتو چۆ بکەن بەڕێگە کراوەکانیدا.

دوای نۆسەد و پەنچا ساڵ لەبانگەواز کردن و کۆششیکی زۆر لەپێناوی ڕێنمایی کردنی گەلەکەی، کۆمەڵێکی کەم نەبێت هیچ کەس بەدەم بانگەوازەکەیدا نەچوو، بگرە بەدرۆشیان خستەوە و تەنانەت وەسفی شێتیشیان دایە پاڵی، هەتا گەیشتە ڕادەیەک کە هەرەشەی بەردباران کردن (ڕەجم) یان لێ کرد:

{{قَالُوا لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَا نُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ الْمَرْجُومِينَ ﴿١١٦﴾}}.الشعراء

واتە گوتیان: ئەی (نوح) ئەگەر کۆڵ نەدەیت و کۆتایی بەم باسانە نەهێنیت، بەڕاستی لەڕەجم کراوان دەبیت (بەردبارانت دەکەین).

بۆیە (نوح) پەنای بردەوە بەر خودای گەورە وسکاڵای لەدەست گەلەکەی لەلا کردن:
{{قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوْمِي كَذَّبُونِ ﴿١١٧﴾ فَافْتَحْ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا وَنَجِّنِي وَمَن مَّعِي مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٨﴾}}.الشعراء
واتە: گوتی ئەی پەروەردگار بەڕاستی قەومەکەم بڕوایان پێ نەکردم. کەواتە داواکارم سەرکەوتنم پێ ببەخشیت بەسەریاندا و دەروم لێ بکەیتەوە و خۆم و ئیماندارانی یاوەریشم ڕزگار بکەیت.
هەروەها نزای تیاچوونی لەگەلەکەی کرد:{{وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴿٢٧﴾}} .نوح
واتە: ئەی پەروەردگار هیچ کەسێک لەبێ بڕوایان لەسەر زەویدا مەهێڵە و تۆویان ببڕە. چونکە بەڕاستی تۆ ئەگەر وازیان لێ بهینیت هەرچی بەندەکانی تۆیە گومڕای دەکەن و کەسیشیان لێ نابێت (لەنەوەی تازە) مەگەر خراپەکار و تاوانبار نەبێت.

# ژیانی نوح
## به شی یه که م

دوای کۆچی دوایی باوکی مرۆڤایەتی (آدمْ) سەلامی خوای لەسەر بێت، مندالأو نەوەکانی لەسەر رێبازی باوکیان بەردەوام بوونو خواناسو خواپەرست مانەوەو هاوبەشیان بۆ خوای گەورە بڕیار نەدەداو، هەر لەسەر هەمان پڕۆگرامی باوکیان بەردەوام بوون تا هەزاران سالأ دوای کۆچی دوایی باوکیشیان.
ابن عباس دەڵێت: ماوەی نێوان ئادەمو نوح سەلامی خوایان لەسەر بێت دە سەدە بووە هەردووکیان لەسەر شەریعەتو رێگای راستو دروست بوون ... حاکم ریوایەتی کردوو لە (المستدرك)دا بەژمارە (٣٦١٣) و دەڵێت: ئەم فەرموودەیە صەحیحە بە درێژایی چەندین سال، بە چاکەو چاکەکاری دەژیانو لە هەموو خەڵک باشتر خواپەرستیان دەکرد، مەردوومیش ئەوانیان زۆر خۆش دەویستو باشیان دەناسینو پێگەو مەکانەتێکی بەرزیان هەبوو لەناو دەروونی خەڵکداو کە ژمارەی ئەو کەسە چاکو پاکانە پێنج کەس بوون، بە ناوەکانی (ود، سواع، ویغوث، ویعوق، ونسر).

دوای ماوەیەک هەر پێنجیان کۆچی دواییان کردو، خەڵک بە پەرۆشو نیگەران بوون بۆ ماڵئاواییانو لە دونیا دەرچوونیانو بەتێکڕایی بۆیان دەگریانو ماتەمو خەمو پەژارە دایگرتن، بۆیە شەیتان ئەم پەرۆشو حوزنەی بەهەل زانی و وەسوەسەو دڵەڕاوکێی خستە
دڵی کۆمەڵێک هاوەل و هاوڕێیانو تا لە ئەنجامدا بیریان لەوە کردەوە بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی لە دڵیاندا دروستبووە لە شێوەی ئەوان پەیکەریان بۆ دروست بکەن، بۆ ئەوەی هەمیشە لە یادیانبنو هەرگیز لە بیریان نەچنەوە، شەیتان دەستی بەکار کردوو راستەخۆ شێوەی پەیکەرتاشینی فێری ئەم خەڵکە دەکرد بۆ ئەوەی پەیکەر بۆ ئەو پیاو چاکانە دروست بکەن، پێنج پەیکەریان لە شێوەی ئەو پیاو چاکانەدا دروست کردو، دواتر شەیتان لە رێگەی وەسوەسەوە جارێکی تر هەوڵیدا بۆ ئەوەی ئەم پەیکەرانە لەناو شوێنی پەرستگاکانیان دابنێن، بۆ ئەوەی لەکاتی عیبادەتا بەرگریان لێ بکەن، ئەم کارەیان ئەنجامداو هەر لەسەریشی بەردەوام بوون تا هەموو ئەو کەسانە مردن کە ئەم پەیکەرانەیان دروست کردبوو، دوای ئەوانیش کوڕەکانیان هاتنە پێشەوەو دواتر نەوەکانیان،

تا له ئەنجامدا هۆکاری دروستکردنی ئەو پەیکەرانەیان لەبیر چوویەوە کە لەلایەن بابو باپیرانیانەوە دروستکرابوون، ئینجا شەیتان وەک پیشەی هەمیشەیی خۆی، دەستی کردەوە بە دروستکردنی وەسوەسە.
کە ئەم پەیکەرانە لەلایەن بابو باپیرانیانەوە پەرستراونو عیبادەتیان کردوون، وە هۆکاری سەرکەوتنو رزقو رۆزیان بوونە، هەر بۆیە خەڵکەکە دەستیان کردەوە بە بت پەرستی، کە ئەم بت پەرستیە بە سەرەتای دەستپێکردنی بت پەرستی دائەنرێت لەسەر زەویداو بوو بەسەرەتای سەرهەڵدانی هاوبەش بڕیاردان (الشرك باللّٰه) بۆ خوای گەورە، جیل لەدوای جیل ئەم شیرکو بت پەرستیە بلاَو ئەبوویەوە تا وای لێ هات تەواوی سەر زەوی گرتەوەو بەشێوەیەکی بەربلاَو تەشەنەی دەکرد.
پاشان خوای گەورە ئیرادەی خێرو چاکەی بڕیاردا بۆ دانیشتوانی سەر زەوی‌و ویستی لە کوفرو گومڕایی‌و سەرگەردانی رزگاریان بکات، لە رێگەی ناردنی پێغەمبەر لە خۆیان بۆ بانگ کردنیان بۆ خواپەرستی راستەقینەو یەکتاپەرستی،

خوای گەورە حەزرەتی (نوح)ی رەوانە کردو کردی بە پێغەمبەر، نوح (علیة السلام) بە سروشت بڕوادارێکی بەرز بوو، هەمیشە باسی پەیمانی خودای دەکرد بۆ حەزرەتی ئادەمو کوڕو نەوەکانی، کاتێک خوای گەورە کردی بە نوێنەری خۆیو پەیامی ئاسمانی پێسپارد، رووی کردە گەلەکەیو بانگی دەکردن بۆ خواپەرستیو دوورکەوتنەوە لە بت پەرستیو نەفامی، خوای گەورە دەفەرمووآ [لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ فَقَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ إِنِّيَ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عذاب يوم عظيم] (الاعراف: ٥٩) واتە: سوێند بە خوا بە پێغەمبەریەتی (نوح)مان نارده لای هۆزو نەتەوەکەی خۆیو گوتی ئەی هۆزو نەتەوەو گەلی من بەس (اللّه) بپەرستن، کە جگە لەو هیچ خوایەکی تر نییە شیاوی پەرستن بێت، واتە: نابآ پەیڕەوی لە بەرنامەی هیچ کەسێکی تر بکەن، چونکە ئەگەر ئێوە بڕوا نەهێنن، بەڕاستی من لە سزای ئەو رۆژە گەورەیە لێتان دەترسم کە دێتە پێشەوە.ئینجا (نوح) سەلامی خوای لەسەر بێت سەرنجی گەلو نەتەوەکەی خۆی راکێشا بۆ بیرکردنەوە لە نازو نیعمەتەکانی خودای گەورە کە بەسەریدا رشتوونو تآ فکرین لە چەندین بەڵگەو نیشانەی گرنگ لە ناخو لاشەو دەروونی خۆیانو بوونەوەر بەگشتی.

هەروەک خودای گەورە لەسەر زمانی (نوح) سەلامی خوای لەسەر بێت، دەفەرمووێ:

[مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا*وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا*أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا*وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا*وَاللَّهُ أَنبَتَكُم مِّنَ الْأَرْضِ نَبَاتًا*ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا*وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ بِسَاطًا*لِتَسْلُكُوا مِنْهَا سُبُلًا فِجَاجًا] (نوح: ١٣-٢٠)
واتە: ئەوە چیتانە لە گەورەیو شکۆمەندی خوا ناترسن، خۆ بێگومان خوای گەورە ئێوەی بە چەند قۆناغێک دروست کردووە لە تنۆکآ ئاو، خوێنپارە، گۆشتپارە..هتد، وە ئایا نەتان بینیوە چۆن خوا حەوت ئاسمانی نهۆم لەسەر نهۆم دروست کردووەو مانگی کردووە رووناکی تیایاندا، واتە: ئاسمانی یەکەمی پآ رووناک کردۆتەوە، وە بە هەموو ئەستێرەکانیش چونکە ئەوانیش هەریەکەیان مانگێکی خۆی هەیەو خۆریشی کردووە بە چراو هەموو بوونەوەر سوودی لێ وەردەگرآ، وە خوای تاکو تەنیایە ئێوەی لە توخمەکانی زەوی رواندونی بە رواندن وەک رووەکو گیا، پاشان دوای مردنتان ئەتان گێڕێتەوە

بۆ ناوی‌و لەوآ بە فەرمانی خۆی ئەشاردرێنەوە، وە
ئەتان هێنێتەوە دەرەوە، لە زەوی بەدەرهێنان،
واتە: زیندووتان ئەکاتەوەو بە دادگەرانەش
پاداشتو تۆڵەتان دەست ئەکەوێتەوە، وە
هەرخودایە زەوی بۆ ئێوە راخستووەو بە
راخستنێک لەسەری قەرار بگرن، تا بە ئاسانی
بەڕێگا فراوانو دۆڵەکانیدا بڕۆن، دەسا بۆ وورد
نابنەوەو بیر ناکەنەوە.. تا ئیمان و باور بێنن
پاشان (نوح) سەلامی خوای لەسەر بێت، دەستی
کرد بە قسەو گفتوگۆ لەگەل گەل و هۆزی خۆی بە
زمانێکی پاڕاوو رەوانبێژی‌و، بەشێوەیەکی جوانو
پوخت گەورەیی ئیمان هێنان بە خوای تاکو
تەنهای بۆ روون دەکردنەوەوە، سوودی تەوبەو
پەشیمانی‌و گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە لەسەر
تاوانی بتپەرستی بۆ رۆشن دەکردنەوەو، داوای لێ
دەکردن کە پاشگەزببنەوەو داوای بەخشین لە
خوای میهرەبان بکەن.بە گەلەکەی دەگووت:
[فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا * يُرْسِلِ
السَّمَاء عَلَيْكُم مِّدْرَارًا * وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ
وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَارًا * مَّا لَكُمْ لَا
تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا] (نوح: ١٠-١٣).

واتە: جا بەردەوام پێم گوتن: داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگارتان بکەن، چونکە هەمیشە گوناح پۆشە، ئەگەر ئێوە بڕوا بێنن بە فەرمانەکانی خوا، بارانتان پەیتا پەیتاو بەلێزمە بۆ دەبارێنێت، وە رزقو دارایی‌و کوڕی زۆرتان پێ دەبەخشێت، کە چەندین باخو بێستانتان دەداتێ کە باشترین هۆکارن بۆ رابواردنو خۆشی گەلان، وە ئاوو رووباری زۆریشتان بۆ بەدی دێنێت کە لەژێر بنکی درەختەکانیەوە، ئەو چۆمەئاوە دێ و دەڕوات.
بەلآم هۆزو نەتەوەکەی ئەو پەیامەیان رەتکردەوەو پشتیان تێ کردو بەدرۆو کوفریان لە قەڵەمداو، ئامادە نەبوون گوێ بگرن و بەڵکو لێی دوورکەوتنەوەو سەرە پەنجەکانیان ئەختستە ناو گوێچکەیانەوە بۆ ئەوەی گوێ بیستی قسەکانی نەبن، وە دەمو چاویشیان دادەپۆشی بۆ ئەوەی نەیبینن، (نوح) سەلامی خوای لەسەر بێت، دەستی بە نزاو پاڕانەوە کرد لە خوای گەورەو دەیگوت: [قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا * فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَائِي إِلَّا فِرَارًا * وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوا أَصَابِعَهُمْ فِي آذَانِهِمْ وَاسْتَغْشَوْا ثِيَابَهُمْ وَأَصَرُّوا وَاسْتَكْبَرُوا اسْتِكْبَارًا] (نوح: ٥-٧)

واتە: ووتی: ئەی پەروەردگارم .. بەڕاستی من بە شەوو رۆژ بانگی گەلەکەمم دەکرد بۆ بڕواهێنانو یەکتاپەرستی، بەڵام تا دەهات زیاتر دوور دەکەوتنەوەو هەڵدەهاتن، وە بەڕاستی هەر کاتێک بانگم دەکردن بۆ ئیمانو تەوحید تا تۆ لێیان خۆش ببیت، پەنجەیان دەخستە گوێیانەوە، وە خۆیان دادەپۆشی بەجلو بەرگەکانیان، بۆ ئەوەی ووتەکانم نەبیستنو نەمبینن، وە سووربوون لەسەر بێ بڕواییو خۆیان زۆر بە گەورە دەزانیو شوێنم نەکەوتن.
ژمارەیەکی کەم نەبێ لە گەلەکەی ئیمانیان نەهێنا، کە ژمارەیان هەشتا کەس دەبوو، زۆربەیان لە چینی هەژارو کەم دەرامەت بوون، بەڵام خانەدانو دەسەڵاتدارەکانی نەتەوەکەی بە پیری بانگی راستەقینەیەوە نەهاتنو رەتیان دەکرد ەوەو بگرە تۆمەتباریان دەکرد بەوەی شێت بووەو گاڵتەیان بەو کەسانە دەکرد کە ئیمانیان پێی دەهێنا، چونکە فەقیرو هەژار بوون، وە داوایان لە (نوح) دەکرد لە خۆیان دوورخاتەوە تاوەکو لێی رازی بنو باوەڕی پآ بێنن، ئەمەش یاریو فێڵێکی گلآو بوو لەلایەن بێ بڕواکانەوە لە دژی پەیامەکەی، هەر بۆیە (نوح) سەلامی خوای لەسەر بێت هەر زوو لە پیلانەکە تێگەیشتو پێی گوتن:

[وَيَا قَوْمِ لا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مَالاً إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى اللّهِ وَمَآ أَنَاْ بِطَارِدِ الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّهُم مُّلاَقُو رَبِّهِمْ وَلَـكِنِّيَ أَرَاكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ * وَيَا قَوْمِ مَن يَنصُرُنِي مِنَ اللّهِ إِن طَرَدتُّهُمْ أَفَلاَ تَذَكَّرُونَ * وَلاَ أَقُولُ لَكُمْ عِندِي خَزَآئِنُ اللّهِ وَلاَ أَعْلَمُ الْغَيْبَ وَلاَ أَقُولُ إِنِّي مَلَكٌ وَلاَ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزْدَرِي أَعْيُنُكُمْ لَن يُؤْتِيَهُمُ اللّهُ خَيْرًا اللّهُ أَعْلَمُ بِمَا فِي أَنفُسِهِمْ إِنِّي إِذًا لَّمِنَ الظَّالِمِينَ] (هود: ٢٩-٣١)

واتە: ئەی قەومو هۆزی من: بزانن کە من لە بەرامبەر گەیاندنی ئەم پەیامو بەرنامەیەم، هیچ پاداشتێکم لە ئێوە ناوێ، هەتا بە لاتانەوە قورس بێتو بۆتان نەدرێت، چونکە پاداشتی من هەر لەسەر خوایەو هەر لەوم دەوێ، هەرگیزیش ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو شوێنم کەوتوون لەبەر قسەی ئێوە دووریان ناخەمەوە، (دیارە ئەوان داوایان کردبوو کە: بڕوادارەکان لە کۆڕو دانیشتنەکاندا وەدەرنآ، ئەوسا دێنە لای هەروەک قوڕەیش هەمان داخوازیان لە پێغەمبەر هەبوو)، چونکە بێگومان ئەوان لە رۆژی قیامەتدا لەگەل پەروەردگاری خۆیان دیدەنی دەکەن بە دیداری شاد دەبنو شکایەتی من دەکەن لە لای ئەو، بەلآم راستیەکەی من ئێوە بە هۆزو گەلێکی نەفامو نەزان دەبینم، ئەگینا چۆن داوای دەرکردنی ئەو

ئیمانداره هه‌ژارانه‌تان ده‌کرد، و به گێله پیاوو
نه‌زانتان ده‌زانین، ئه‌ی قه‌ومو هۆزی من، چ که‌سآ
ده‌توانآ یارمه‌تیم بداو له سزای خوا رزگارم بکا
ئه‌گه‌ر ئه‌و بڕوادارانه‌م دوورخسته‌وه‌و ده‌رم کردن،
ئایا هیچ بیر ناکه‌نه‌وه که چه‌نده تاوانه
ده‌رکردنیان، من هه‌ر له‌به‌رئه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌رم نالێم
گه‌نجینه‌و خه‌زێنه‌ی خوا لای منه، تا ئه‌وه‌ی شوێنم
ده‌که‌ولێ ده‌وڵه‌مه‌ندی بکه‌م، ناشڵێم من ئاگام له
نادیارو شتی غه‌یبیه، ناشڵێم من فریشته‌یه‌کم،
نێردراوم بۆ لاتان تا به درۆزنم بزانن، وه ناشڵێم
به‌و ئیماندارانه‌ی که له‌به‌رچاوی سوکو بآ نرخن، که
خوا هه‌رگیز خێرو چاکه‌یان له‌گه‌ل ناکاو له‌سه‌ر
رێگه‌ی راست نین وه‌ک ئێوه پێتان وایه، خوا
خۆی چاک ده‌زانلێ چ له دلأو ده‌روونیان دایه، و
پاداشو تۆڵه‌شیان هه‌ر به‌پێ ی ئه‌وه‌ی له‌نێو دڵیان
دایه ده‌داته‌وه، ئه‌گه‌ر من ئه‌وه بکه‌م که ئێوه
ده‌یلێن، بێگومان ده‌چمه ریزی سته‌مکارانه‌وه.
(نوح) سه‌لامی خوای له‌سه‌ر بێت، بآ ئومێد نه‌بوو
له هۆزو نه‌ته‌وه‌که‌ی، هه‌میشه بانگی ئه‌کردن بۆ
لای رێگه‌ی خوا، به‌یانی‌و ئێواره به ئاشکراو نهێنی،
له ماڵه‌کانیانو له شوێنه گشتییه‌کان هه‌ر له‌گه‌ڵیان
خه‌ریک بوو  قه‌ناعه‌ت پێ هێنانیانی ئه‌دا، تا رۆژو
مانگو سال رۆیشتنو بگره نۆسه‌دو په‌نجا سال
بانگه‌وازی ئه‌م په‌یامه درێژه‌ی کێشا، (نوح) به‌بلێ

ماندووبوون بەردەوامە لەسەر ڕێبازەکەی وبانگەشەی خواپەرستی، کەچی تەنها یەک کەسیشی دوای نەکەوت، دەرکەوت بۆی کە سەرکەوتوو نابێت لەگەڵ ئەم بێ بڕوایانەدا، و خوای پەروەردگاریش لە ڕێگەی وەحیەوە ئەمەی بۆ پشت ڕاست دەکاتەوەو دەفەرمووآ: [وَأُوحِيَ إِلَى نُوحٍ أَنَّهُ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلاَّ مَن قَدْ آمَنَ فَلاَ تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ] (هود: ٣٦).
واتە: وەحی و سروش بۆ نوح هاتە خوارەوەو گووتی: دەبلێ چاک بزانیت کە جگە لەوانەی لەمەوبەر بڕوایان هێناوە، ئیتر کەسێکی دی لە هۆزەکەت باوەڕ ناهێنلێ، کەوابوو لەو کارانەی کە دەیکەن خەفەتبار مەبە، چونکە دەرەنجام تۆ ڕزگار ئەبی، و ئەوان تیا دەچن.
پاش ئەوەی (نوح) سەلامی خوای لەسەر بێت، بە هەموو شێوەیەک لەگەلأ گەلەکەیدا هەولی داو بێ هیواو بلێ ئومێد بوو کە پاشگەز نابنەوە لە کوفرو بلێ باوەڕیو هیچ چاکەو خێر، نە لە خۆیانو وەچەو نەسلیان ڕەچاو ناکرێت، بانگەوازی ڕاگرت و پێی وابوو ئەبێ سزایەکی زۆر توند بدرێن، بۆ ئەوەی دەست هەڵگرن لە زوڵمو ستەمکاریو زەوی ڕزگاری بێت لە شەڕو ئاژاوەیان، هەر بۆیە، دەستی

نزای بەرزکردەوە بۆ لای خواو داوای سزادانو تۆڵەی کرد بۆ بێ باوەڕەکان ئەوانەی چەندین ساڵە بە دەستیانەوە ئازار دەکێشێ و وەلآمی بانگەوازی خوایی نادەنەوە، بۆ ئەوەی ئەوانەش کە باوەڕیان هێناوەو شوێنی کەوتوون پەشیمان نەبنەوە، دووعای کردوو فەرمووی: [وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا*إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا] (نوح: ٢٦- ٢٧) دیارە نوح زۆر سزای دەروونی چەشتووە بۆیە بە تووڕەییەکی زۆرەوە دەفەرمووێ: ئەی پەروەردگارم: تەنها بێ باوەڕێکیش لەسەر زەوی بە زیندووی مەهێڵەوە (واتة: هةموويان لةناو ببة)، جا خوای گەورەش وەلآمی دایەوەو هەموو تیاچوون، تەنانەت کوڕەکەی خۆیشی، چونکە گوێ رایەڵ‌ی‌و فەرمانبەرداری نەکردووو، لێی دوورکەوتەوە چونکە ئەگەر تۆ وازیان لێ بێنیت هەرچی بەندەکانتن لە رێ لا ئەدەنو گومڕایان دەکەنو هیچ منداڵێکیشیان نابێ، مەگەر بێ بڕواو خوانەناس، چونکە منالێک لە ئایندەدا لە کۆشی ئەوانەدا پەروەردە بێت، گومان نییە کە هەروەک خۆیان دەردەچێت، چونکە کەسێک (٩٥٠) ساڵ لەناو

گەلەکەیدا بژی، لە وردو درشتیان دەناسێتو دەشزانێت چی لەبارەیاندا هەیە.
خوای گەورە وەڵآمی (نوح) ئەداتەوەو نزاو پاڕانەوەکەی قبولأ دەکات، و سروش ئەنێ رێت بۆی، کە چاوەڕوانبە لەمەولا سزاو بەلآی گەورە بۆیان دێت، دوای ئەوەی نوح ئاگاداری کردنەوە کە سزای قوڕس بەڕێوەیە بۆیان، دەستیان کرد بە گاڵتەجاریو گوتیان
[يَا نُوحُ قَدْ جَادَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَالَنَا فَأْتَنِا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ] (هود:٣٢).

واتە: ئەی نوح بەڕاستی شەڕە قسەو دەمەقاڵێی زۆرت لەگەل کردینو زۆریش لەسەری رۆیشتی، دەسا لەگەل ئەوەشدا زۆر بە چاکی بزانە کە: ئێمە هەرگیز دوای خۆتو بەرنامەکەت ناکەوین، دەسا ئەگەر تۆ دەتوانیو لە راستگۆیانیت، ئەو سزایەمان بۆ بهێنە، بەڵێنمان پێ دەدەیت.
(نوح) لە وەلآمدا پێ ی گوتن: [إِنَّمَا يَأْتِيكُم بِهِ اللّهُ إِن شَاء وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ] (هود:٣٣). واتە: نوح ووتی: بەڕاستی هێنانی ئەو سزایە هەر بەدەستی خوایەو هەر ئەویش دەتوانێت بیهێنێ بۆتان ئەگەر ویستی، کە هێنایشی ئیتر ئێوە ناتوانن بەرهەڵستی بکەنو دەستەوسان بوەستێ. پاشان

خوا فەرمانی بە (نوح) کرد سەلامی خوای لێ بێت، کە کەشتییەکی گەورە دروست بکات، فەرمووی:
[وَاصْنَعِ الْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا وَلاَ تُخَاطِبْنِي فِي الَّذِينَ ظَلَمُواْ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ] (هود:٣٧).
واتە: دەبێ لەژێر چاودێری خۆمانەوەو بەپێی سروشو فەرمانی خۆمان کەشتییەک دروست بکەیتو خەڵکە موسڵمانەکەی سوار بکەیت، و ئیتر لەمەڕ ئەوانەی ستەمیان کردووە لێم مەپاڕێوە، بۆ رزگاربوونو لەناو نەچوونیان، چونکە بەڕاستی بڕیار دراوە کە دەبێ ئەوانە نقوم ببنو بخنکێن، واتە: کار لەکار ترازاوەو قسەی پێ ناوێ.

# چیرۆکی چوارەم
# پێغە مبە ر هود

پاش ئەوەی منال ونەوەی حەزرەتی نوح علیە السلام پەرتەیان کرد لەسەر روی زەوی ، گەلێکی نویّ هاتە ئاراوە ئەویش گەلی (عاد) ئەم گەلە لە باکوری دوورگەی عەرەبی لە لای بیری ئیرەم نیشتەجیّ بوون ئەم خاکەی کە ئەوان لێی دەژیان ناوی (الاحقاف) بوو خوا نیعمەتێکی زۆری لەگەل ئەوان کردبوو لە هێزو تواناو بالادەستی و خۆشی و هێمنایی لەوپەری رابواردن و شادی دەژیان کانی وکانیاویان زۆر بوو شینایی ودەغل ودانیان دەکرد لەگەل ئەو نیعمەتانەش هێزی لەشیان پیّ درابوو کە زۆر بە هێز بون بەم ژیانە شوکر نەبوون بەلکو دەستیان کرد بە زولم وزۆرداری و دەست درێژکردنە سەر مال و سامانی خەلك ، سەرەرای ئەمانەش اصلا سوپاسی خوایان هەرنەدەکرد چونکە ئەم نیعمەتانەیان لە خوا حیساب نەدەکرد بەلکو ئەوانیش پەیکەرێکیان بۆ خۆیان دروست کردبوو کە ناوی (صمود) بوو وە یەکێکی تریشیان هەبوو بە ناوی( الهتار) دەیان پەرست بۆیە تاوەکو بێنەوە سەر راستە رێگای جاران وخواپەرستی خوا پێغەمبەرێکی بەرێزو نازداری نارد کە ناوی

پیرۆزی (هود) بوو سەلامی خوای لەسەربێ ئەو پێغەمبەرە خاوەن حەسەب و ناوداربوو بە زیرەکی و دەست پاکی وراست گۆیی بانگیانی کرد بۆ خوا پەرستی بۆ وازهینان لە ستەم کردن لە خەلکی بەلام وەکو ئەوانی تر کەللە رەق بوون و وەلامیان بەتوندی داوەو گوتیان (من اشد منا قوە) پێمان بلێ کێ هەیە لە ئێمە بەهێزو تواناتر؟ حەزرەتی نوح سەرسام بوو ئەم وەلامەی چاوەروان نەدەکرد لەگەلەکەی بەلکو زۆریش بەنەرمی وەلامیانی داوە وەکو پێغەمبەرانی تر کە نەرم ونیانی سیفەتی ئەوانە، هەستا بە ئامۆژگاری کردن وباشترین رێنمایی کردن بەلام بەداخەوە زیاتر بەرەو عینادی و کەللەرەقی چون هەتا وای لێهات پێیان گووت(سواء علینا اوعظت ام لم تکن من الواعظین)) لای ئێمە یەکسانە واتە ئامۆژگاریمان بکەی ونەکەی وەکو یەك وایە ، هەر بەوەندەش وازیان نەهێنا بەلکە پێیان گوت تۆ کەسێکی نەفامی و ناتێگەیشتی بەلام حەزرەتی هود زۆر بە لەسەر خۆیی وەلامی دایەوەو فەرمووی: ئەی گەلەکەم من نە نەفام و نە ناتێگەیشتیم بەلکو من نلردراوم لە لایەن خوای پەروەردگارەوە بۆ ئێوە ناردراوم ، ئەمجارە گوتیان

تۆ شێتی و هەر وازیان نەهێنا لە بت پەرستی
لێرەوە حەزرەتی هود زۆر بە دلێکی پر لە ئیمانەوە
فەرمووی من خوا دەکەم بەشاهید و ئێوەش
شاهێد بن من دوورم لەو رەفتارەی کە ئێوە
ئەنجامی ئەدەن بەلام ئەوان هەر بروایان نەهێنا
چەند کەسانێکی کەم نەبی بروایان نەهێنا و هەر
زیاتر تاوانیان ئەنجام دەداو رویان لە کوفر بوو
نەوەك ئیمان .
پێغەمبەری خوا (هود) -٢-
پاش ئەوەی گەلی عاد زیاتر دەستیان کرد بە مل
ملانێ و عینادی زیاتر و وەلامی پێغەمبەری
خوا(هود) علیه السلام نەداوە ولەگەل ئەوەشدا
بروادارن بروایان پتەوتر دەبوو زیاتر ئارامیان
گرت بەرامبەر ئەو ئێش و ئازارەی کە لەراست بێ
بروکان دەیان چێژت ئا لەو کاتی حەزرەتی هود
سەلامی خوای لەسەر بێ ئەوانی ئاگادار کردەوە
وترساندیانی لە عەزابی خوا بەهۆی ئەو پشت تێ
کردنەی و تاوان ئەنجام دانەی و
فەرموی(( لاتتولوا مجرمین)) بەلام بیرو هۆشیان
هەموی مۆر کرابوو لەسەر ستەم و زۆرداری
وەلامی پێغەمبەری خوایان داوە بە توندترین

شێوەو گوتیان ((أجئتنا لنعبد اللّٰه وحده ونذر ما کان یعبد آباؤنا فأتنا بما تعدنا إن کنت من الصادقین )) ئایا تۆ کەهاتووی بە نیازی ئەوە کە ئێمە تەنها یەك خوا بپەرستین وواز لە خوایەکانمان بهینین کە باب و باتپیرانمان دەیان پەرست ؟ دە ئەگەر راستە با عەزابمان بۆ بێت و ئەوەی کە تۆ دەیلێیت بابێتە دی ئەگەر راست دەکەیت ؟ بەلێ بەم قسەیەی ئەوان کردیان هەموو ریگایەکیان لەبەردەمی حەزرەتی هود داخست وهیچ چارەی نەما تەنها ئەوەندە کە پێیان رابگەینێ ئەوا خۆتان توشی سزای خوا کرد لەو کات و ساتەدا باران نەما و زەوی ووشك هەلگەرا وشینایی نەما ئەوەی مەرو مالات بوو هەمووی مردن و لە ناوچوون و توشی گرانی و هەژاری هاتن لە ژیانی خۆشی و هێمنایەتی بەرەو ژیانی نەداری و ئازار و ئەزیەت کەوتنە رێ کە ئەم سزایە ماوەی (سێ سالی) خایەند هەتا نزیك بوو هەموویان توشی هەلاکەت بن هێشتا حەزرەتی هود داوای لێکردن کە تەوبەو ئیستغفار بکەن و بروا بهێنن وپەیمانی پێیاندا کە بگەرێنەوە بارودۆخی جاران لە خۆشی و هێمنی بەلام گەلی عاد هەر لەسەر عینادی خۆیان بەردەوام بوون

بەلکو زیاتر ئینجا لەو کاتدا پێغەمبەری خوا
کەزانی هیچ رێگە چارە نەماوە بۆ هیدایەتیان
فەرمووی ئەی گەلەکەم ئێوە شاهێد
بن من بەریم لە ئێوە لەو شیرکەی دەیکەن لێرەوە
پەیامی حەزرەتی هود کۆتایی پێ دێت و لەو
تەنگانەی بێ بارانی هەورێکی رەش دێت و گەلی
عاد بە دلێکی خۆشەوە وادەزانن ئەوا بارانیان بۆ
هات بەلام حەزرەتی هود فەرموی پەلە مەکەن
ئەمە نەك باران بەلکو عەزابی خوای لەژێرەوەیە
لەناکاو هەلی کردە رەشەبایەکی زۆرلا توند کە
هەرچی هەبا رایدەمالی بەرەو ئاسمان بەرزی
دەکردەوە و بەزەویانی دائەدا وئەم رەشەبایە
ئەوەی هەیبوو لولی داو وێرانی کرد وئەم گەلە
بون بە سەربردەو کەسیان نەماو تەفرو
تونابوون .بەم شێوەیە کۆتایی هات بە باسی ئەم
گەلە خوا بمان پارێزی لە تورەبونی خۆی ان شاء
اللّٰه تعالی.

—•❀✿❁✲❁✿❀•—

کۆشکەکان و بتەکانی گەلی عاد گەلی عاد بە
درووستکرنی کۆشکی بەرز بەناوبانگ بوون...
شانازییان بە کردنەوەی کۆشك و تەلاری زۆر
بەرزو جوان بەسەر یەکدا دەکرد... قورئان
دەفەرموێ ئەو کۆشکەکانە لە( ئەحقاف) بوون،
مێژوونووسانیش دەڵێن ئەحقاف کەوتۆتە
نێوان( یەمەن) و (عوممان)وە... گەلی عاد زۆر
دەوڵەمەندانە ژیانیان بەسەر بردووە... خاکێکی
سەوزو جوانیان هەبووە... ماڵی زۆریان هەبووە...
ئەسپ و وشترو مەڕوماڵاتیان دەشت و دەریان
پڕکردووە...
بەڵام گەلی عاد خوای پەروەردگار یان نەدەناسی و
سوپاسی خوای گەورەیان لەسەر ئەو هەموو رزق
و رۆزییە نەدەکرد، خۆیان لە بەرد بتیان دروست
دەکردو دەیانپەرست، سێ بتیان هەبوو
بەناوی(صداء) و (صمود)و ( هباء) لێیان
دەپاڕانەوەو داوای رزق و رۆزییان لێدەکردن.
بانگەواز بۆ لای خوای گەورە
خوای گەورە لە نێو بنەماڵە ناودارەکانی عاددا
پیاوێکی بەناوی هود هەڵبژاردو کردی بە
پێغەمبەر، خوای گەورە ویستی وابوو لەناو
خۆیاندا پیاوێکی راستگۆو بەڕەوشت بکاتە نێرراو
تا هەموویان بیناسن و لێی تێبگەن و باوەڕی
پێبکەن.

هود دەستی کرد بە بانگەوازو پێی وتن: ئەی گەلەکەم خوای گەورە بپەرستن لەو زیاتر خوایەکی ترتان نییە.
هەروەها وتی: خەڵکینە ئێوە چۆن بەرد دەپەرستن و ئەو کەسە ناپەرستن کە درووستی کردوون؟
گەلی عاد بە قسەکانی هود زۆر دڵیان ناخۆش دەبوو پێیان وت: ئێمە نازانین تۆ چیت دەوێ؟ تۆ یان شێتی ئێمە لێو تێناگەین..! یان گەوجیت و درۆدەکەیت..!
بەڵام هود بەو پەڕی ئەدەبەوە وتی: خەڵکینە من شێت نیم، بەڵکوو من پێغەمبەری خوام بۆ ئێوە، من پەیامی خوای گەورەم بۆ ئێوە هێناوە.
خەڵکەکە نەیان دەزانی چی بڵێن، پێیان وت: خواکەی ئێمە لە تۆ توڕە بووە، تۆی شێت کردووەو مێشکی تێکداوی و نەگبەتی رووی تێکردووی!
هود وتی: ئەم بتانەی ئێوە کەڵك و زیانیان بۆ کەس نییە، ئەم بتانە بەردن... نەئەبیستن... نە قسەدەکەن... خۆشتان و بتەکانتان نە خێرتان بەدەستەو نە شەڕ... من لە خواکانی ئێوە ناترسم... من دوورم لە هاوەڵ بۆ خوا پەیداکردن... لە ئێوەش ناترسم چیتان لە دەست دێت بیکەن... من تەنها پشت بە خوای گەورە دەبەستم... هەرچی لە

جیهاندا هەیە بەدەست خوای کردگارە... تەنانەت گەڵایەك بەبێ ڕەزامەندی ئەو لە دار ناکەوێتە خوارەوە.
وەبیرهێنانەوەی نیعمەتەکانی خوای گەورە
هود هەمیشە نازو نیعمەتەکانی خوای گەورەی بیر خەڵکەکە دەخستەوە، هود پێی وتن: ئەو خوایە بپەرستن کە رزق وسامانی زۆر کردوون و کۆشك و تەلاری جوانی داونەتێ... ئەو خوایە بپەرستن کە نەوەی زۆر کردوون و خۆشتانی بەهێز درووست کردووە... ئەو خوایە بپەرستن کە ئێوەی بە میراتگری قەومی نوح کردووە.
هود وتی: دەبوو لە پاداشتی ئەم هەموو نازو نیعمەتەدا تەنها خوای گەورەتان بپەرستایە.
بەڵام گەلی عاد بە قسەی هودیان نەکردو سوپاسی خوای گەورەیان نەدەکرد بۆ ئەم رزق و رۆزییەی کە خوا دابووی پێیان.
گەلی عاد لەبیریان چووبوەوە کە خوای گەورە لەسەر بتپەرستی لافاوی بەسەر قەومی نوحدا هێناو هەموویانی لەناوبرد؛ تەنها باوەڕداران نەبێ خوای گەورە رزگاری کردن.
گوفتوگۆ لەگەڵ گەلی عاد
گەلی عاد ئامۆژگارییەکانی هودییان نەئەبیست و باوەڕیان نەدەهێنا، وتیان: ئەی هود تۆ هیچ

بەڵگەیەکت نییەو بە قسەی تۆ واز لە خواکانی خۆمان ناهێنین و باوەڕت پێناهێنین.
هەروەها وتیان: ئێمەش بڕوامان بە خوای تۆ نییەو لێی ناترسین، تۆ زۆر جار باسی سزای خواکەت دەکەی، ئەی کوانێ ئەم سزایە کەی دێت؟
هود وتی: خوای گەورە توڕەیە لێتان و سزاتان بۆ دەنێرێ، بەڵام کەی؟ ئەوە خوای گەورە خۆی دەزانێ، من تەنها ئاگادارکردنی ئێوەم لەسەرە.
گەلی عاد وتیان: ئێمە چاوەڕوانی ئەو سزایە دەکەین، پێمان خۆشە با ئەو سزایە بێت!
هود وتی: کەواتە چاوەڕوانی سزابن، منیش لەگەڵتانا چاوەڕێ دەبم!
رزگاربوونی باوەڕداران و تیاچوونی کافران
خوای گەورە چەند ساڵێك بارانی لە گەلی عاد گرتەوەو بارانی بۆ نەباراندن، زۆر پێویستییان بە باران بوو، هەموو رۆژێك سەیری ئاسمانیان دەکردو چاوەڕێی باران بوون.
هود وتی: ئەی قەومەکەم بۆ لای خوای گەورە بگەڕێنەوەو داوای لێخۆشبوونی لێبکەن، بەهێزترتان دەکاو بارانتان بۆ دەبارێنێ، واز لە تاوانباری بهێنن و پشت لە خوای گەورە هەڵ مەکەن.

بەلام گەلی عاد کەللە رەق بوون و ژیرییان بەکارنەدەهێنا... بەردەوام سەرکەشییان دەکردو ستەمیان لە بێهێز دەکرد... وەك دڕندە هەژارو لاوازەکانیان دەترساند... لە سزای رۆژی قیامەت نەدەترسان.
رۆژێکیان هەورێك هات و بەری ئاسمانی گرت، خەڵکەکە لە خۆشیدا سەمایان دەکردو هاواریان دەکرد: هەوری بارانە... باران دەبارێ... بەڵام هود وتی: ئەوە هەوری باران و خۆشی نییە، بەڵکوو ئەوە هەوری تۆفانەو سزایەکی سەختی پێوەیە.
هەورێکی رەش بەری دنیای گرت و تاریکی باڵی بەسەر گەلی عاددا کێشا ... تۆفان هەڵی کرد...
بەڵام خەڵکەکە هەرگیز شتی وایان نەدیبوو، ترسیان لێنیشتوو هەموو رایان کرد خۆیان لە کۆشکەکانیاندا ئەشاردەوە، بەڵام تۆفانەکە ٧ شەوو ٨ رۆژی خایاند... کشتوکاڵ و درەختەکانی لە بن دەرهێنان... کۆشك و تەلاری هەموو رووخاندن.
وشترو ئەسپ و مەڕو ماڵاتیانی هەڵ ئەگرت و دوور فڕێی ئەدان... هەموو خەڵکەکەی کوشت و لاشەی لەو ناوەدا فڕێدان...
بەڵام خوای گەورە هودو باوەڕدارانی پەناداو پاراستنی، لە رۆژێکدا کە پەنا تەنها پەنای خوای گەورەیە... گەلی عادیش بەهۆی کافری وکەللە رەقییانەوە هەموویان تیاچوون.

# چیرۆکی پێنجەم
# پێغه مبه ر صالح

{{وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُواْ إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُّجِيبٌ۝﴿٦١﴾}} [هود].
واتە: بۆ هۆزی ( ثمود ) یش صالح ی برایانمان* ڕەوانە کرد ، گوتی: ئەی خزمەکانم گوێڕایەڵی خودای گەورە بکەن، جگە لەو زاتە هیچ خودایەکی دیکەتان نیە، ئەو بەرپای کردوون لە زەویدا و داوای لێکردوون کە ئاوەدانی بکەنەوە، جا کەوابوو داوای لێ خۆشبوونی لێ بکەن پاشان بگەڕێنەوە بۆ لای و فەرمانەکانی بەجێ بهێنن، چونکە بەڕاستی پەروەردگاری من زۆر نزیکە و نزا وەرگرە (لەو کەسانەی لێی دەپاڕێنەوە و داوای لێ خۆشبوونی لێ دەکەن).
خودای گەورە (صالح) ی نێرراو و پێغەمبەری خۆی بۆلای گەلی (ثمود) نارد تاکو بانگیان بکات بۆ پەرستنی خودا و وازهێنان لە (بت پەرستی).
لە قورئانی پیرۆزدا نشینگەکانی ئەم گەلە دیاری نەکراوە، بەڵکو هەر ئەوەندەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەم گەلە لە چەند ناوچەیەکی شاخاویدا

نیشتەجێ بوون و خانووەکانیان لە بەردی
گەورەی ناو شاخەکان دروست کردووە و لە
دۆڵەکە نیشتەجێ بوون. خودای گەورە
دەفەرموێ: {{وَثَمُودَ الَّذِينَ جَابُوا الصَّخْرَ بِالْوَادِ
﴿٩﴾ }}.(ألفجر). واتە: ئایا نەتزانیووە قەومی ثمود
یش خودا چی لێکردن، ئەوانەی لە دۆڵ و
شیوەکانەوە بەردیان دەتاشی و دەیانگواستەوە بۆ
ناو قەدی چیاکان و لەوێ خانوویان دروست
دەکرد؟ .
لەم ئایەتەی سەرەوەدا باسی (الواد) هاتووە، بە
مانای (دۆڵ) یا دۆڵەکە، وادیارە مەبەست لەو دۆڵە
(وادی القری)یە کە دەکەوێتە بەینی (مەدینە) و
(شام) کەئەو گەلەی لێ نیشتەجێ بوون.
هەرووهاچیرۆک گێرەوەکانیش باسی بیرێک
دەکەن بەناوی (بیری "ثمود") هەر لەناوچەکەدایە.
لە صحیحي بخاری هاتووە: پێغەمبەری
پێشەوامان () ڕێی نەداوە بەهاوەڵانی (الصحابة)
لە ئاوی ئەو بیرە بخۆنەوە کەبەلایدا ڕۆیشتوون
لەکاتی جەنگی (تبوک)، تەنانەت ڕێگریی ئەوەیشی
لێکردون کەلەدەورووبەری ناوچەکە دانیشن.[١]
گەلی (ثمود) دەستیان کرد بەدرۆخستنەوەی

پێغەمبەر (صالح) وەك چۆن گەلانی پێشوویان بەهەمان شێوە پێغەمبەرانی خودایان بەدرۆ دەخستەوە، بەهێچ جۆرێك بەدەم بانگەوازی خودا بەیەكگرتن و لەخوداترسانەوە نەچوون، خودای گەورە دەفەرمویٚ:

{{كَذَّبَتْ ثَمُودُ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٤١﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَالِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٤٣﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٤٤﴾وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٤٥﴾ أَتُتْرَكُونَ فِي مَا هَاهُنَا آمِنِينَ ﴿١٤٦﴾فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾وَتَنْحِتُونَ مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا فَارِهِينَ ﴿١٤٩﴾فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٥٠﴾ وَلَا تُطِيعُوا أَمْرَ الْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾الَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿١٥٢﴾}}.
[ألشعراء].

واتە: قەومی (ثمود) یش بڕوایان بە پێغەمبەران نەكرد، كاتێك (صالح) ی برایان پێی گوتن: باشە ئەوە ئێوە لەخودا ناترسن، پارێزگار نابن؟ بەڕاستی دڵنیابن كە من فرستادەیەكی ئەمین و دڵسۆزم بۆتان. كەوابوو لەخودا بترسن و فەرمانبەرداری من بكەن. من داوای هیچ جۆرە پاداشتێكتان لیٚ ناكەم لەسەری، من تەنها پاداشتی خۆم لە

پەروەردگاری جیهانەکان دەخوازم. ئایا واگومان دەبەن هەروا ئالێرەدا بەخۆشی و ئاسوودەیی دەهێڵرێنەوە لەناو باخ و کانیاوی سازگاردا؟!! لە ناو بێستان و دارخورمادا کەخورمای نەرم و ناسك و بەتام دەگرێت؟!! .(هەروەها بۆتان دەلوێت) ماڵ و شوینی خۆش لەچیاکان دابتاشن و بەجوانی دروستی بکەن و بەخۆشی و بەبێ باکی تێیدا بژین (پاشان سوپاسی خودا نەکەن لەسەریان و کڕنووشی بەندایەتی بۆنەبەن لەسەر ئەو هەموو نیعمەتە گەورانە)؟!!!! دە ئیدی لەخودا بترسن و فەرمانبەرداری من بکەن (لەو فەرمانانەدا کە ڕێنمایی ئێوەی پێ دەکەم). بە فەرمانی موسریف و لەسنوور دەرچووەکان هەڵس و کەوت مەکەن. ئەوانەی کە تۆوی فەساد و تاوان لە زەویدا دەچێنن و هەرگیز چاکسازی نازانن .
پێغەمبەر (صالح) بەردەوام بوو لەئامۆژگاری کردنی گەلەکەی و پێی دەگوتن: یادی ئەو کاتەش بکەنەوە کە خودا ئێوەی کردە جێنشین لەدوای قەومی عاد، ژیانی لەسەر زەویدا بۆ ئاسان کردن، لە دەشتەکاندا کۆشك و تەلار دروست دەکەن، لە شاخ و کێوەکانیشدا ژوور دادەتاشن، کەواتە یادی ناز و نیعمەتەکانی خودا بکەن و تۆوی خراپە و

فەساد و گوناه لەسەر زەویدا مەچێنن. {{وَاذْكُرُواْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاء مِن بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِي الأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ الْجِبَالَ بُيُوتًا فَاذْكُرُواْ آلاء اللّهِ وَلاَ تَعْثَوْا فِي الأَرْضِ مُفْسِدِينَ}} ألأعراف/٧٤.

لەجیاتی ئەوەی بەدەم بانگەوازەکەی (صالح) دا بڕۆن کە ڕێگای ڕاست و حەقی بۆ ڕوون دەکردنەوە و داوای لێ دەکردن کە واز لە بت پەرستن بهێنن و داوای لێ بووردن لەخودای گەورە بکەن هەتا خودای گەورە بەدەنگیانەوە بێت وجوابی دوعایان بداتەوە و لێیان ببورێت. بەڵام ئەو گەلە زۆر کەللە ڕەق بوون، خۆیان کەڕکرد و چاویان لەڕاست حەق کوێر کرد و باوەڕیان پێ نەکرد و وەڵامیان دایەوە و گوتیان: ئەی صالح، بەڕاستی پێش ئەم باسانەت تۆ لەناو ئێمەدا شوێنی هیوامان بوویت، ئایا بەرگری ئەوەمان لێدەکەیت لەپەرستنی ئەو خودایانەی کە باو و باپیرانمان شوینی کەوتوون و پەرستوویانن؟!! ئێمە لەگوماندااین لەو بانگەوازەی تۆ و بەدبینین لێی.

{{قَالُواْ يَا صَالِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَذَا أَتَنْهَانَا أَن نَّعْبُدَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا وَإِنَّنَا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ مُرِيبٍ }} ألأعراف/٦٢.

"ثمود" داوای موعجیزەیەك دەكەن گەلی "ثمود" تۆمەتی ئەوەیان خستە پاڵ "صالح" کە گوایە عەقڵی تێک چووە و سیحری لێکراوە و ئەو سیحرە هەموو هۆش و هەست و نەستی داگیر کردووە و وای لێکردووە تاخۆی بەپێغەمبەرێکی ڕەوانەکراوی خودا بزانێت. وە بۆئەوەی بیسەلمێنێت کەبەڕاستی پێغەمبەرە داویان لێکرد موعجیزەیەکیان بۆ بەڵگە لەسەر پێغەمبەرێتی یەکەی پێشان بدات :
{{قَالُوا إِنَّمَا أَنتَ مِنَ الْمُسَحَّرِينَ ۝{١٥٣}۝مَا أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا فَأْتِ بِآيَةٍ إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ ۝{١٥٤}۝ قَالَ هَذِهِ نَاقَةٌ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ۝{١٥٥}۝وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ ۝{١٥٦}۝}}. ألشعراء.
واتە: خودانەناسان گوتیان: وادیارە تۆ بەڕاستی لەوانەی کە فێڵ و جادووت لێکراوە!! تۆ جگە لەوەی کەهەر بەشەرێکی وەکو ئێمە، هیچی دی نیت، بەڵگەیەکمان نیشان بدە ئەگەر لە ڕاستگۆیانیت؟ (جا خودا بەتوانا حوشترێکی بۆ بەدیهێنان، تا دەمکوتیان بکات و بیانویان ببڕێت)، ئینجا - صالح ـ پێغەمبەر پێی گوتن: ئەمە حوشترێکە موعجیزەیەکە دەبێت ڕۆژێک نۆرە

ئاوی ئەو بێت و ڕۆژێکیش بۆ ئێوە، دیاریکراو بێت. نەکەن دەستدرێژی بکەنە سەر و ئازاری بدەن، بەهۆی ئەوەوە سزایەکی سەخت لەڕۆژێکی سامناکدا یەخەتان دەگرێت.
هەر لەم بارەیەوە خودای پەروەردگار دەفەرموێ: {{كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِالنُّذُرِ ﴿٢٣﴾ فَقَالُوا أَبَشَرًا مِّنَّا وَاحِدًا نَّتَّبِعُهُ إِنَّا إِذًا لَّفِي ضَلَالٍ وَسُعُرٍ ﴿٢٤﴾ أَؤُلْقِيَ الذِّكْرُ عَلَيْهِ مِن بَيْنِنَا بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ ﴿٢٥﴾ سَيَعْلَمُونَ غَدًا مَّنِ الْكَذَّابُ الْأَشِرُ ﴿٢٦﴾ إِنَّا مُرْسِلُو النَّاقَةِ فِتْنَةً لَّهُمْ فَارْتَقِبْهُمْ وَاصْطَبِرْ ﴿٢٧﴾ وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ الْمَاءَ قِسْمَةٌ بَيْنَهُمْ كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ ﴿٢٨﴾}}. ألقمر.
واتە: "ثمود" یش هەموو بێدارکردنەوە و داچڵەکاندنێکیان بە درۆ زانی و بڕوایان پێ نەبوو. جا گوتیان باشە ڕەوایە: ئێمە شوێنی تاکە کەسێك بکەوین لەخۆمان؟!، ئێمە ئەگەر بڕوا بە کەسێکی وا بکەین، ئەو کاتە ئێمە بەڕاستی لەگومڕایی و شێتی داین؟! ئایا ڕاستە لەنێوان ئێمەدا وەحی و نیگا بۆ ئەو ڕەوانە کرابێت، نەخێر شتی وا نابێت، بەڵکو ئەو هەر کابرایەکی زۆر درۆزن و خۆ پەرستە و حەز بە گەورەیی دەکات!! سبەی دەزانن و بۆیان دەردەکەوێت کە کێ درۆزن و خۆ پەرست و خۆ بەگەورە زانە. بێگومان ئێمە حوشترێکمان

داناوه و (ناردووه) بۆ تاقیکردنەوەیان، تۆش ئەی ـ صالح ـ چاوەڕوان و چاودێری سەرەنجامیان بە، ئارامیش لە سەر ئازار و ئەشکەنجەیان بگرە و پەلە مەکە و هەواڵیشیان بدەرێ: کە ئاوەکە بەشکراوە (ڕۆژێك بۆ ئەوان و ماڵاتەکەیان، ڕۆژێکیش بۆ حوشترەکەیە) و هەر لایەنەش لە ڕۆژی سەرە (نۆبە) ی خۆیدا ئامادە بێت.

تەقینەوەی دوژمنایەتی

کافرەکان زۆر دەترسان لەنەمان و تێداچوونی موڵک و دەسەڵاتیان دوای ئەوەی بۆیان ئاشکرا بوو کە زۆربەی خەڵکی لەگەلەکەی (صالح) ڕاستی پێغەمبەرێتی ئەویان بۆ دەرکەوتبوو بە بۆنەی (موعجیزەی پەیدابوونی حوشترەکە). هەر بۆیەش لەناخەوە ڕکێکی زۆریان لە حوشترەکە بوو وە هەڵوێستی ڕکەبەری و دوژمنایەتییان بەرامبەر (صالح) و باوەڕداران گرتەبەر. (صالح) هەستی بەو هەڵوێستە شەڕخوازیانەی ئەوان کرد و پێی گوتن: ئەی قەوم و کەسم بۆچی ئێوە پەلەی خراپەتانە پێش چاکە و حەز دەکەن بەڵا و ناخۆشیتان بەسەربێت، ئەدی بۆچی داوای لێخۆشبوون لە خودا ناکەن بو ئەوەی ڕەحمتان پێ بکات؟ خەڵکەکە لە وەڵامدا گوتیان: ئێمە تووشی

شووم و نەگبەتی بووین بە هۆی تۆ و ئەوانەی لەگەڵ تۆدان (واتە ئیماندارەکان)، صالح گوتی: نەخێر وانیە، نەگبەتی و شوومتان لە لایەن خوداوە بۆدێت (ئەگەر بەردەوام بن لەسەر یاخی بوونتان)، بەڵکو ئێوە قەومێکن کە تاقی دەکرێنەوە:{{قَالَ يَا قَوْمِ لِمَ تَسْتَعْجِلُونَ بِالسَّيِّئَةِ قَبْلَ الْحَسَنَةِ لَوْلَا تَسْتَغْفِرُونَ اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالُوا اطَّيَّرْنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَ قَالَ طَائِرُكُمْ عِندَ اللَّهِ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تُفْتَنُونَ ﴿٤٧﴾}}. ألنمل.

سەربڕینی حوشترەکە

دەستەی دەسەڵاتدارە لووت بەرزەکان لەقەومەکە سەرزەنشتی چەوسێنراوەکانیان دەکرد لەوانەیان کە باوەڕیان هێناوە: باشە ئێوە دەزانن کە (صالح) لەلایەن پەروەردگاریەوە ڕەوانە کراوە؟! لەوەڵامدا ئیمانداران گوتیان: بە دڵنیابییەوە ئێمە باوەڕدارین بەو پەیامەی کە بەودا ڕەوانە کراوە:

{{قَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُواْ مِن قَوْمِهِ لِلَّذِينَ اسْتُضْعِفُواْ لِمَنْ آمَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَالِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِ قَالُواْ إِنَّا بِمَا أُرْسِلَ بِهِ مُؤْمِنُونَ ﴿٧٥﴾قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُواْ إِنَّا بِالَّذِيَ آمَنتُمْ بِهِ كَافِرُونَ ﴿٧٦﴾}}.ألأعراف.

سەرانی ئەو گەلە زۆر ناڕەحەت بوون بە وجودی حوشترەکە و لەوەش دەترسان کە ژمارەی

باوەڕداران بە بۆنەی ئەو حوشترە زیاد بکات، بۆیە ئەوە وای لێکردن هەوڵی کوشتنی حوشترەکە بدەن سەرەڕای ئەو ئاگاداری یە و هۆشداری یەی لەلایەن پێغەمبەرەکەیانەوە ئاڕاستەیان کراوە دەربارەی سزادانیان و هەڕەشە لێ کردنیشیان بەتیاچوون گەر بەخراپی توخنی حوشترەکە بکەون، کەچی ئەوان بێ باکانە حوشترەکەیان سەربڕی و لەفەرمانی پەروەردگاریان یاخی بوون و گوتیان: ئەی صَالِحٌ، ئەگەر تۆ لەپێغەمبەرانیت ئادەی ئەو هەڕەشانەی کەلێمان دەکەیت بۆمان پێش بهێنە:
{{فَعَقَرُواْ النَّاقَةَ وَعَتَوْاْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ وَقَالُواْ يَا صَالِحُ ائْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴿٧٧﴾}}.ألأعراف.
دوای سەربڕینی حوشترەکە خودای گەورە وادەی سزای بۆ دانان ئەویش بریتی بوو لە سێ ڕۆژ:
{{فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ ذَلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ ﴿٦٥﴾ }}. هود.[٢]
واتە: یەکسەر چوون سەریان بڕی، جا (صالح) یش پێی گوتن: ڕابوێرن لە ماڵ و مەنزڵی خۆتاندا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ، (دوای ئەو ماوە دیاری کراوە تێدا دەچن) و ئەوەش پەیمانێکە و هەرگیز بەدرۆ ناخرێتەوە.

پیلان گێڕان بۆ کوشتنی (صالح) پێغەمبەر
{{وَكَانَ فِي الْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿٤٨﴾ قَالُوا تَقَاسَمُوا بِاللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُ وَأَهْلَهُ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِ مَا شَهِدْنَا مَهْلِكَ أَهْلِهِ وَإِنَّا لَصَادِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَمَكَرُوا مَكْرًا وَمَكَرْنَا مَكْرًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٠﴾}}. ألنمل.
واتە: لەو شارەدا نۆ دەستە هەبوو کە گوناه و تاوانیان ئەنجام دەدا و تۆوی خراپەیان لە وڵاتدا دەچاند و بەلای چاکە و چاکەکاریدا نەدەچوون. هەموویان سوێندیان بە خودا بۆ یەکتر خوارد کە لەشەودا بدەن بەسەر (صالح) و ماڵ و منداڵیدا و لەناویان بەرن، پاشان (ئەگەر گومانیان لێکردین) سوێند دەخۆین و بە کەس و کاری دەڵێین: ئێمە ئاگامان لە تێداچوونی ئەوان نیە و دڵنیابن ئێمە ڕاستگۆشین. (ئەو تاوانبارانە) پیلان و تەڵەیان گێڕا (بۆ لەناوبردنی صالح و شوێنکەوتووانی) ئێمەش نەخشەیەکی دیکەمان کێشا (بۆ ڕزگارکردنی ئیمانداران و لەناوبردنی خودا نەناسان) ئەوان ئاگایان لێ نەبوو، هەستیان پێ نەدەکرد.
چارەنووسی ڕەشی گەلی "ثمود"

خودای پەروەردگار دەفەرمویٚ:
{{فَلَمَّا جَاء أَمْرُنَا نَجَّيْنَا صَالِحًا وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَمِنْ خِزْيِ يَوْمِئِذٍ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ الْقَوِيُّ الْعَزِيزُ ﴿٦٦﴾ وَأَخَذَ الَّذِينَ ظَلَمُواْ الصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دِيَارِهِمْ جَاثِمِينَ ﴿٦٧﴾ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْاْ فِيهَا أَلاَ إِنَّ ثَمُودَ كَفَرُواْ رَبَّهُمْ أَلاَ بُعْدًا لِّثَمُودَ ﴿٦٨﴾ }}. هود.
واتە: جا کاتێك فەرمانی ئێمە هات و بڕیاردرا لەکاتی دیاری کراودا، ئێمە (صالح) و ئەوانەی بڕوایان هێنابوو لەگەڵیدا ڕزگارمان کردن بە میهرەبانی و بەزەیی خۆمان، لەسەرشۆڕی ئەو ڕۆژەش پەناماندان، بەڕاستی پەروەردگارت هەر خۆی خاوەنی هێز و باڵادەستە. جا ئەو دەنگە سامناکەی - کە بووە هۆی تێداچوونیان - هەموو ئەوانەی گرتەوە کە تاوان و ستەمیان کرد و فەرمانبەرداری پەروەردگاریان نەبوون، سەرەنجام هەموویان لەشوێنەکانی خۆیاندا کەوتن بەڕووی زەویدا و تێداچوون لە بەرەبەیاندا.وەك ئەوەی لەو شوێنەدا نەبووبن و تێیدا نەژیابن، بەڕاستی هۆزی ثَمُودَ بێ بڕوا بوون بە پەروەردگاریان، ئاگاداربن بڕیاری دووری لە بەزەیی خودا درا بۆ هۆزی ثَمُودَیش.
ئەوەیە ئەنجامی لووت بەرزی و لەخۆ بایی بوون و بێ باوەڕی، بەڕاستی ئەم سزایەی کەگەلی

(ثمود) ی گرتەوەو هەر وەها گەلانی پێشووتریش بەهۆی پشت کردنە خودای پەروەردگار و بێ باوەڕییان، بێگومان گەلانی دیکەش دەگریتەوە کە لەڕیی حەق لادەدەن و بێ ویژدانن. ئەمەش بێگومان پەندێکی کاریگەرە کە قورئانی پیرۆز دەیخاتە بەر چاوانمان تاکو بەتینترین وانەی لێ وەربگرین.

لەناوچوونی گەلی "ثمود"

لە ناوبردنی گەلی "ثمود" بە هەورە تریشقە (ألصاعقة) بووە، هەوروەک خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ:

{{وَفِي ثَمُودَ إِذْ قِيلَ لَهُمْ تَمَتَّعُوا حَتَّى حِينٍ ۝{٤٣} فَعَتَوْا عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ فَأَخَذَتْهُمُ الصَّاعِقَةُ وَهُمْ يَنظُرُونَ ۝{٤٤} فَمَا اسْتَطَاعُوا مِن قِيَامٍ وَمَا كَانُوا مُنتَصِرِينَ ۝{٤٥}}}. ألذاريات.

واتە: هەروەها لە بەسەرهاتی ثمودیشدا پەند و ئامۆژگاری هەیە، کاتێک پێیان گوترا: تا ماوەیەک ڕابوێرن!! ئەوانیش لە فەرمانی پەروەردگاریان یاخی بوون، کتوپڕ بروسکەیەک پێچانیەوە و بەچاوی ئەبڵەقەوە دەیانڕوانی. ئیدی نەیانتوانی هەستنە سەر پێ و سەرکەوتووش نەبوون. وشەی "صاعقة" بەو بروسکە گەورەیە (کە ئاگرێکی

ئاسمان) ە دەگوترێت کە پێك دێت لە شۆرتێکی
کارەبایی نێوان دوو بارگەی جیاوازی کارەبایی
سارد و گەرم (موجب و سالب) کە لە هەوردا
ڕوودەدا و ئەو کاتەی دەگاتە سەر زەوی، جگە
لەوەی کە دەنگێکی بەهێزی هەیە ئەوا مەترسی
سووتانی ئەو شوێنەی هەیە کە بەری دەکەوێ،
هەروەها کەبەردی گەورەشی لێ بێت وردی
دەکات و گەر خانو و بیناشی لێ بێت دەڕووخێت.
هەروەها قورئان لەهەندێک شوێندا وشەی (رجفه
ـ واتە زەمین لەرزەی توند) و وشەی (طاغیة۔ واتە
دەنگی زۆر بەهێز) ی بەکارهێناوە:
{{فَأَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دَارِهِمْ جَاثِمِينَ
{٧٨}}}. ألأعراف. {{كَذَّبَتْ ثَمُودُ وَعَادٌ بِالْقَارِعَةِ
{٤}فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهْلِكُوا بِالطَّاغِيَةِ {٥}}}. ألحاقة.
چا لەبەر ئەوەی هەورە تریشقە (صاعقة) دەنگێکی
گەورە دروست دەکات بە وشەی (صیحة) ش
ناوبراوە واتە: دەنگ و هاواری زۆر گەورە:
{{وَأَخَذَ الَّذِينَ ظَلَمُواْ الصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دِيَارِهِمْ
جَاثِمِينَ {٦٧} }}. هود.
لەوانەشە ئەو هەورە تریشقەیە (صاعقة)
لەرزەیەکی وای لەگەڵ دابێت کە لە بوومەلەرزە
بچێت و هەموو دڵێک بەڕووادنی لەرزینەکەی
بلەرزێنێت و ڕابچلەکێنێت. لەوانەشە لەجێ ی

خۆیەوە پەل بهاوێت و زیادەڕۆیی بکات (یطغی) تاکو جێ یەکی دیکەش بگرێتەوە و بەمەش ناوببریت بە (طاغیة). جا ئەو وەسفانەی دی کە قورئان بەچەند گوزارشتێکی دی بۆ (صاعقة) ی داناوە دەربڕینێکی دروست و تەواوە کە وەسفی شوێنەوار و هۆکاری و دیاردەکانی دەکات.

چەند پەند و وانەیەک

لەڕێنماییە جوان و بەهادارەکانی قورئان ئەوەیە:

١ـ پاراستنی ئەو نیعمەتە جوان و بەنرخانەی کە خودای گەورە بۆ بەندەکانی تەرخان کردووە. ٢ ـ داوای ڕێکی و میانڕەوی لە بژێویدا لێکردوون وڕێگەی دەست بڵاوی و پەرش و بەفیڕۆدانی ئەو نیعمەتانەی لێگرتوون, هەروەک لە ئایەتێکی قورئاندا لەسەر زاری هود (علیه السلام) هاتبوو دەڵێت: (بۆچی ئەو هەموو کۆشك و تەلارە گەورانە لە شوێنە بڵندەکاندا دروست دەکەن؟ ئایا بۆ ئەوەیە تاکو ڕادەی دەوڵەمەندی و دەست ڕۆیشتوویتان بزانرێت و بەئومێدی ئەوەن هەمیشە بژین و نەمرن؟:

{{أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ آيَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾}}. ألشعراء.

(هود) ی پێغەمبەر لەکاری بینا و خانووی گەورەدا سەرزەنشتی گەلەکەی دەکات، چونکە ئەوان ئەو جۆرە خانووبەرەیان بە مەبەستی نیشتەجێ بوون و حەوانەوە بنیاد نەنابوو، دەنا سەرزەنشتی نەدەکردن لەسەر ئەو کارە، بەڵکو بەحەز و ئارەزوویان لەشانازی بەخۆوەکردن و لووتبەرزی و خۆ بە گەورەزانینەوە ئەو کۆشک و تەلارانەیان بنیات نابوو، ئەوەش نەریتێکی دەست بڵاوی بێزراوە چونکە لەپشت ئەو کارانەوە بەتەمای نەمریی بوون لە زەویدا و وێڕای ئەوەش کە نەمری (خلود) مەحاڵە و خۆشی ی دنیاش کەمە. (صالح) یش ـ علیه السلام ـ بەهەمان شێوە داوا لەگەلەکەی دەکات کە نیعمەتەکانی خودایان بیر نەچێتەوە و خۆیان بە گەورە نەزانن و لەخۆیان بایی نەبن، خودای گەورە دەفەرموێ:
{{أَتُتْرَكُونَ فِي مَا هَاهُنَا آمِنِينَ ۝{١٤٦} فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ۝{١٤٧} وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ۝{١٤٨} وَتَنْحِتُونَ مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا فَارِهِينَ ۝{١٤٩} فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ۝{١٥٠}}}
واتە: ئایا وا دەزانن هەروا ئالێرەدا بە خۆشی و ئاسوودەیی دەهێڵرێنەوە (ژیانتان کۆتایی نایەت)؟!! لەناو باخ و باخات و کانیاوی

سازگاردا؟!! لە ناو بێستان و دارخورمادا کە
خورمای نەرم و ناسك و بەتام دەگرێت؟!!
(هەروەها بۆتان دەلوێت) ماڵ و شوینی خۆش
لەچیاکان دابتاشن و بەجوانی دروستی بکەن و
بەخۆشی تێیدا کەشخە بکەن؟! لە خودا بترسن و
فەرمانبەرداری من بکەن. [٣]

ئێستاش لەو سەردەمەدا خەڵکێکی زۆر هەن کە بۆ
فەخر و شانازی کۆشك و تەلار و خانووی بڵند و
گەورە بنیاد دەنێن تەنیا بەمەبەستی خۆ
هەڵکێشان و خۆ بەزل زانین، چەند زۆریشە ئەو
پارە و سامانە کە لەبەر دەستی ئەو دەست بڵاوانە
دایە، ئایا نازانن ئەو پارە و موڵکە کە خودای
گەورە داویەتی بەوان هی ئەوان نیە!! هی خودای
گەورەیە، خودای گەورە ئەو سامانەی داونەتی بۆ
تاقی کردنەوەیان لە دنیادا، ئەو سامانە (ئەمانەت)
ـە لای ئەوان دەبێ بزانن لەچی سەرف دەکەن و
ئایا یارمەتی هەژارانی پی دەدەن؟ یاخود پڕۆژە و
کارخانەی بەسوود لەو پارەیە دروست دەکەن کە
هەژاران و خەڵکی بێکار کاری تێدا بکەن؟ یاخود
یارمەتی مانگانە و بەردەوام بۆ ماڵی هەتیو و کەم
دەرامەت دەبڕنەوە وەک (سەدەقەی جاری) بۆیان
بنوسرێت لای خودای گەورە و لە ڕۆژی قیامەتدا
سوودی لێ وەربگرن؟

له ئەبو بەرزەوە (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری پێشەوامان () فەرموویەتی: عن أبي برزة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ():{ لا تزول قدما عبد يوم القيامة حتى يُسأل عن أربع خصال: عن عمره فيم أفناه، وعن شبابه فيم أبلاه، وعن ماله من أين اكتسبه وفيم أنفقه، وعن علمه ماذا عمل فيه}..رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح.
واتە: لەڕۆژی قیامەتدا بەندە کە لەبەردەمی دادگای خودادا ڕادەوەستێ لە شوێنی خۆی ناجوڵێ هەتا ئەو چوار پرسیارەی ڵی دەکرێ: تەمەنی خۆی بەچی بەسەر برد، لەشی خۆی لە چی دا نیوداش کرد، ئەو ماڵەی کە هەیبوو چۆنی پەیدا کرد و لەکوێ هێنای و لەچیدا خەرجی کرد وە ئەو زانستەی کە هەیبوو چی پێی کرد... (ترمذي)
جێگەی سەرسوڕمانە کە مرۆڤیکی دەوڵەمەند کۆشکێکی گەورە و ڕازێنراو دروست دەکات کە چەندەها ژووری تێدایە و بەسەدان هەزار دۆلاری تێ دەچێت، لەکاتیکدا کە بەهەزاران خەڵکی دیکە هەن یەک ژووریان دەست ناکەوێت تێیدا بژین و ئەو دەوڵەمەندەش ئەو هەموو ژوورەی هەیە لە کۆشکەکەی نازانێ لە کام ژووریان بخەوێت. ئەی

واباشتر نەدەبوو گەر ئەو پیاوە دەوڵەمەندە
خاوەن کۆشکە لە خانوویەکی مام ناوەندیدا
بژیایە و هەموو ئەو پارە و سامانە زۆرەی لە
کاروباری ژیانی میللەتدا بەکار بێنایە بۆ
بەگەڕخستنەوەی کشتوکاڵ و پیشەسازی و
پێویستی یە گرنگەکانی خەڵکی؟ ئایینی ئیسلام
ئەم چەمکە دادگەرێتی یە کۆمەڵایەتی یەی لە دڵ
و دەروونی شوینکەوتوانی و پەیڕەوکارانیدا
جێگیر کردووە تاکو کۆمەڵگەی ئیسلامی لەسەر
کۆڵەکە ڕاست و دروستەکانی دادپەروەریی
کۆمەڵایەتی بنیات بنرێت و پاشان تاکو
دەسەڵاتداران و حاکمانی کۆمەڵگەی ئیسلامی
لەوپەڕی شەونخوونی و بێداریدا بن بۆ
ئاگاداربوون لە هەر کەسێک و دەستە و تاقمێك کە
پارە و ماڵی میللەت بۆ هەوا و هەوەس و
ئارەزووە گەندەڵەکانیان بەکار بێنن، چونکە ماڵ و
سامانی دەوڵەمەندان (بە تێڕوانین و یاسای
قورئان) ئەگەرچی لە موڵکدارێتی ی تایبەتیدا
بێت، بەڵام سوودەکەی سوودێکی گشتی یە بۆ
میللەت، بۆ ئەوانەش کە پارە و سامان
ودەسەڵاتیان هەیە، دەبێ زۆر وریا بن نەبن بە
خزمەتکاری ئەو پارە و سامانە و شتێکی وا نەکەن

به هۆی ئەوەوە خودای پەروەردگاریان لەبیر بچێت و پەیوەندییان لەگەڵ خودای گەورە بپچڕێت. خودای گەورە دەفەرموێت:
{{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ ﴿٩﴾ وَأَنفِقُوا مِن مَّا رَزَقْنَاكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَا أَخَّرْتَنِي إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ الصَّالِحِينَ ﴿١٠﴾ وَلَن يُؤَخِّرَ اللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَاءَ أَجَلُهَا ۚ وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١١﴾}}. ألمنافقون.
واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، هەوڵ بدەن نە ماڵ و سامانتان، نە ڕۆڵەکانتان، نەبنە هۆی ئەوەی کە لەیادی خودا و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو کەمتەرخەمی و بێ ئاگاتان بکەن، جا هەرکەس لە یادی خودا کەمتەرخەمی بکات، ئا ئەوانە هەر خۆیان خەسارەتمەند و زەرەرمەندن. لەو ماڵ و زانستی و هێز و دەسەڵاتەی کە پیمان بەخشیوون، ئێوەش لێی ببەخشن و دەستی بەسەردا مەگرن و قۆرخی مەکەن؛ پێش ئەوەی کە مردن یەخە بەیەکێکتان بگرێت و بڵێت: خودای پەروەردگار، خۆزگە ماوەیەکی کەمی دی مۆڵەتت بدامایە تا خێر و چاکەم بکردایە و مال و

سامانم ببەخشیایە و بجوومایەتە ڕیزی چاکانەوە. جا ئەو داخوازییە بەجێ نیە، چونکە ڕۆژی هەرکەسێک تەواو بوو، کاتی مەرگی هەر کەسێك هات، هەرگیز خودا دوای ناخات و مۆڵەتی بۆ تازە ناکاتەوە، خوداش زۆر ئاگایە بە هە موو ئەو کار و کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

٣_ ئیسلام ڕازی نابێت کە شوێنکەوتوانی خۆی ملکەچی چەند ستەمکارێکی لووتبەرز بن ئەوانیش بیانکەن بە کۆیلەی خۆیان و هەموو جۆرە سزا و ئەشکەنجەیەکیشیان پێ بچێژن و بەپێ ی هەوا و ئارەزووەکانیان بەکاریان بێنن.

ئیسلام ڕازی نابێت کە شوێنکەوتوانی خۆی ملکەچی چەند ستەمکارێکی لووتبەرز بن ئەوانیش بیانکەن بە کۆیلەی خۆیان و هەموو جۆرە سزا و ئەشکەنجەیەکیشیان پێ بچێژن و بەپێ ی هەوا و ئارەزووەکانیان بەکاریان بێنن.
بەڵکو بەپێچەوانەوە ئیسلام سوێنکەوتوانی خۆی هان دەدات کە بەڕووی ئەو ستەمکارانەدا ڕاپەڕن و گوێ بە هێز و دەسەڵاتیان نەدەن. چونکە ئەگەر بەڕاستی باوەڕداران خوازیاری ڕزگاری بن ئەوا لەپێناویدا قوربانی دەدەن و دەستیشیان دەکەوێت. بێگومان خودای گەورە و باڵادەستیش

لەقورئاندا مژدەی ئەوەی بەباوەڕداران داوە کە چارەنووسی ستەمکاران هەر زەرەرمەندی و لەناو چوونە: {{وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿١٥﴾}}. إبراهيم ..
٤_چەسپاندنی بیر و باوەڕی یەکتاپەرستی (التوحيد).
٥_ناساندنی شێوازی بانگەوازی پێغەمبەران.
٦_بەئاگابوون لە بت پەرستی لەبەرگی نوێدا.
٧_زانینی شێوازی شوین کەوتنی ڕاست (تبعية ألحق).
٨_پشت بەستن بە خودای گەورە لە هەموو کارێکدا: دیارە هەر کەسێکیش پشت بەخودای پەروەردگاری ببەستێت و پەنا بۆ خالقی خۆی بەرێت کە سەرچاوەی گشت هێزێکە لەوجوودا ئەوە شایستەی ئەوەیە خودا ترسەکەی بە ئارامی بۆ بگۆڕێت و لاوازی یەکەیشی بە (هێز) بۆ بگۆڕێت.
{{إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللّهِ رَبِّي وَرَبِّكُم مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلاَّ هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا إِنَّ رَبِّي عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٦﴾}}.هود.
واتە: چونکە بەڕاستی من پشتم بەخودا بەستووە، کە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەیشە، هیچ گیانلەبەرێک نیە جڵەوی بەدەست خودای

گەورە نەبێت، بێگومان پەروەردگارم لەسەر بەرنامە و ڕێبازکی ڕاست و دروستە. مرۆڤی خاوەن باوەڕی چاکساز و بانگەوازکار پێویستی یەکی هێجگار زۆری بەخودا و بەو پشت بەخودا بەستنە هەیە چونکە دڵنیایی و خۆڕاگری و ڕازی بوونی بە هەرجۆرە قوربانی یەکی لەپێناوی ڕەزامەندی خودادا پێ دەبەخشێت.

٩_ئاکامی خۆ بەزل دانان تێداچوونە وەک لە سوورەتی (فُصِّلَتْ) خودای گەورە دەفەرموێ:

{{فَأَمَّا عَادٌ فَاسْتَكْبَرُوا فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَقَالُوا مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿١٥﴾ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِي أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ الْخِزْيِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَخْزَى وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٦﴾}}. فُصِّلَت.

واتە: ئەوسا قەومی عاد بە ناحەق خۆیان بە گەورە زانی لە زەویدا و گوتیان: کێ هەیە بە ئەندازەی ئێمە هێز و دەسەڵاتی هەبێت؟ باشە ئایا ئەوە نەیانزانی بەڕاستی ئەو خودایەی کەدروستی کردوون، ئەو لەوان هێزی زۆر زیاترە (بەڵکو هەر بەراورد ناکرێت) و ئەوانە هەر ئینکاری ئایەت و موعجیزەکانی ئێمەیان دەکرد. ئەوسا ئیتر ئێمە بایەکی ساردمان هەڵکردە سەریان لەچەند

ڕۆژێکی شوومدا، تا هەر لەژیانی دنیادا بەسزای
سەرشۆڕیان بگەیەنین و تاڵاو بکەین بە
گەروویاندا، بێگومان سزای قیامەت زیاتر
سەرشۆڕکەر و تاڵترە و ئەوانە سەرفراز و ڕزگار
نابن.
ئەو ئیدیعا و خۆهەڵکێشانی ئەو سەردەمەی گەلی
(عاد) یش هەمان ئیدیعا و خۆهەڵکیشانی دەوڵەتە
گەورە و زلهێزەکانی ئەمڕۆشە کە بەناحەق
میللەتان دەچەوسێننەوە و خۆیان کردووە
بەگەورەی هەموو میللەتان و سەروەت و
سامانیان زەوت دەکەن و بێ ویژدانانە مامەڵەیان
لەگەڵ دەکەن، ئەوجا دەوڵەتانی دی کەسەرەکانیان
ویژدانی خۆیان فرۆشتووە بەو وڵاتە زلهێزانە
ئەوانیش لەلای خۆیانەوە خەریکی
چەوساندنەوەی میللەتانی بێ دەسەڵات و ئاشتی
خوازی دیکەن، بۆ نموونە میللەتی ئاشتیخوازی
(کورد) کە ساڵەهای ساڵە دەناڵێنێ لەدەست
دەوڵەتانی سەر بەو وڵاتە زلهێزانە و خەریکی تاڵان
کردن وزەوت کردنی سەروەت و سامانی میللەتی
(کورد) ن، بەوەشەوە ناوەستن بەڵکو هەموو
شێوازێکی نابەجێ و ناڕەوایان گرتووتە بەر بۆ
دەرکردنیان لەسەر خاکی باو باپیریان و زەوت
کردنی زەوییەکانیان و جێ نشین کردنی میللەتانی

دی لەسەر ئەم خاکە و دەمێکە ئەوان خەرێکی ئەم سیاسەتە چەپەڵەن و ئێستاش هەر بەردەوامن!!!!
زمانی حاڵیشیان دەڵێت: {{مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً}}.
هەروەك کە لەئایەتی ژمارە (١٥) ی سوورەتی (فُصِّلَتْ) یشدا هاتووە.
بە پشت بەستنی میللەتی کورد بە خودای گەورە و ڕازی کردنی ئەو زاتە لە هەموو کارێکدا، إن شاء اللّٰه ئەو میللەتە سەرکەوتوودەبێ و دوژمنانیشی سەرشۆڕدەبن.



## چیرۆکی شەشەم
## ژياني پێغەمەر ابراهيم

ولقد اتيناإِبْرَاهِيمَ رُشْدَهُ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِه عَالِمِينَ ﴿٥١﴾إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَا هَذِهِ التَّمَاثِيلُ الَّتِي أَنتُمْ لَهَا عَاكِفُونَ ﴿٥٢﴾قَالُوا وَجَدْنَا آبَاءنَا لَهَا عَابِدِينَ ﴿٥٣﴾قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَآبَاؤُكُمْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٥٤﴾قَالُوا أَجِئْتَنَا بِالْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ اللَّاعِبِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الَّذِي فَطَرَهُنَّ وَأَنَا عَلَى ذَلِكُم مِّنَ الشَّاهِدِينَ ﴿٥٦﴾}}.ألأنبياء.
بێگومان ئێمە ژیری و هۆشمەندیمان پێشتر بە ئیبراهیم بەخشی، ئێمە چاك ئەومان دەناسی. کاتێك بە باوک و قەومەکەی دەگوت: ئەم بتانە چیە ئێوە هەمیشە بە دەوریدا دێن و دەیانپەرستن؟. لە وەڵامدا (تەنها بەڵگەیان ئەوە بوو، کە) گوتیان: ئێمە باوو باپیرانمان بینیوە ئەوانەیان پەرستووە. ئیبراهیم گوتی: ئیوە و باوو باپیرانی ئێوە لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بوون. خەڵکەکە گوتیان: ئایا تۆ پەیامێکی ڕاستت بۆ ئێمە هیناوە یان گاڵتەمان لەگەڵدا دەکەیت؟! ئیبراهیم گوتی: نەخێر بەڕاستی دەدوێم و پەروەردگارتان پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویە و کە بەدی هێناون و منیش بۆتان دەسەلمێنم.

لەگەڵ پێغەمبەرێکی دی لە پێغەمبەرانی خودا ئەویش (ئیبراهیم)ـە.......
ئیبراهیم (سەلامی خودای لەسەر بێت) پلە و پایەیەکی گەورەی هەیە لەلای( مسوڵمانان، یەهوودی یەکان و نەسرانی یەکان) و ناوەکەشی هەمیشە بە ڕێزلێنان و نزا و شکۆداری یەوە بەستراوەتەوە...چونکە یەکێکە لە پێغەمبەرانی خاوەن عەزم (اولی العزم) و لە پێناوی بانگەواز بۆ پەرستنی خودا و بەیەک دانانیدا جیهادی کردووە خۆی خستووەتە بەر مردنیش لە پێناوی ئەو بیر و باوەڕەی کە ئیمانی پێ هێنابوو.
هەروەها پلە و پایە و بەرزی شان و شکۆی (ئیبراهیم) لەوەدا دەدرەوشێتەوە کە باوکی پێغەمبەرانە و هەر کتێبێک لە ئاسمانەوە بۆ سەر پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرانی دوای خۆی نێررابێتە خوارەوە لە وەچەو پەیڕەوکاران و ڕەچەڵەکی خۆی بوون[٤]. ئەوەش جێ و مەقامێکی وەهایە بۆ ئیبراهیم (علیە السلام) کە هیچ جێ و مەقامێکی دیکەی پێ ناگات، چونکە ئەو دوو کوڕی هەبووە و خودا کردوونی بە پێغەمبەر و ناویان ئیسماعیل (علیە السلام) و ئیسحاق (علیە السلام) بووە.(ئیسماعیل) باپیرە گەورەی

پێغەمبەری پێشەوامانە محمد (علیه السلام)[٥] و باپیرەی عەرەبی (حیجاز) ـە و عەرەبی (حیجاز) یش بنەچە و (نەسەبیان) بۆ هەردوو کوڕەکەی ئیسماعیل (علیه السلام) دەگەڕێتەوە واتە بۆ (نابت و قیذار)[٦]. قورئانی پیرۆزیش ئاماژەی بۆ باوکایەتی (أبوة) ـەی ئیبراهیم (علیه السلام) لە عەرەبدا کردووە، هەروەک خودا تێیدا ڕووی گفتاری کردووەتە ئیماندارانی عەرەب و دەفەرموێ:
{{وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ۝{٧٨}}}.
ألحج.
واتە: خودا لە ئایین و بەرنامەکەیدا هیچ جۆرە شتێکی ناڕەوا و قورس و گرانی لەسەر دانەناون (کە نەتوانن ئەنجامی بدەن، جا ئەم بەرنامەیە) ڕێ و شوێن و بەرنامەی ئیبراهیمی بابە گەورەتانە کە پێشتر هەر خودای گەورە ناوی (مسوڵمان) ی لێ ناون.
هەروەها خودای گەورە کوڕیکی داوە بە (ئیسحاق) بە ناوی (یەعقووب) ئەویش هەر پێغەمبەر بووە و نازناوەکەشی (لقب) بە ـ ئیسرائیل ـ ناو دەبرێت.

ئیبراهیم (علیه السلام) باوکی پیغەمبەرانی دوای خۆیەتی هەروەک خودای گەورە دەفەرموێ:
{{وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ كُلاً هَدَيْنَا وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ وَمِن ذُرِّيَّتِهِ دَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَى وَهَارُونَ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴿٨٤﴾ وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَى وَعِيسَى وَإِلْيَاسَ كُلٌّ مِّنَ الصَّالِحِينَ ﴿٨٥﴾ وَإِسْمَاعِيلَ وَالْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا وَكُلاًّ فضَّلْنَا عَلَى الْعَالَمِينَ ﴿٨٦﴾ وَمِنْ آبَائِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ وَإِخْوَانِهِمْ وَاجْتَبَيْنَاهُمْ وَهَدَيْنَاهُمْ إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٨٧﴾}}. ألأنعام.
واتە: (لەوەودوا) ئیسحاق و یەعقوبمان پێبەخشی، هەریەک لەوانمان ڕێنمویی کرد، پێشتریش (نوح) مان ڕێنمویی کردبوو و لەنەوەکانی (دیکەی ئیبراهیم) داود و سلیمان و ئەییوب و یوسف و موسا و هاروون (هاتنە دنیاوە و بوونە ڕابەڕ و چاوساغ بۆ خەڵکی) ئا بەم شێوەیە پاداشتی چاکەخوازان دەدەینەوە (نەوەی چاک و پاک و خوداناسیان پێدەبەخشین). (هەروەها) زەکەریا و یەحیا و عیسا و ئیلیاس هەرهەموویان لەپاک و چاکان بوون. ئیسماعیل و یەسەع و یونس و لوطیش (لەهیدات دراوو پێغەمبەران بوون) هەریەک لەوانیشمان ڕێزدار کرد بەسەر خەڵکی دیکەدا.

هەروەها هەندێک لەباوانیان و نەوەکانیان و براکانیانمان هەڵبژارد و هیدایەت و ڕێنموویيمان کردن بۆ ڕێگە و ڕێبازی ڕاست و دروست.

ئەگەر سەرنجی ئەو دەقە قورئانی یەی سەرەوە بدەین ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئیبراهیم (علیە السلام) باپیری هەموانە، باپیری جوولەکە و نەسرانی و مسوڵمانە.
ئیبراهیم (علیە السلام) ئەوەندە کەسێکی ڕاستگۆ و ئیماندار و لەخوداترس بووە، بۆیە لای خودا خۆشەویست بووە کردوویەتی بە (خۆشەویستی خۆی). بەڕاستی ئەو پلە و پایە بەرزەی دراوە بە ئیبراهیم (کە گەورەترین و بەرزترین پلەیە بە ئینسانێک درابێ)، ئامانجی هەموو مرۆڤێکی ئیمانداره کە بە پەرۆشی ئەوەیە تەنها خودای گەورە ڕازی بێ لێی. وەک خودای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرموێ:
{{وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ للّه وَهُوَ مُحْسِنٌ واتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَاتَّخَذَ اللّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلاً ۝{١٢٥}}}. ألنّساء.
واتە: کێ هەیە ئاینی چاکتر و پەسندتر و جوانتر بێت لەو کەسەی ڕووی کردۆتە خودا و خۆی

تەسلیمی ئەو زاتە کردووە لە کاتێکدا کارجوان و
کار پەسەندە و شوێنی ئاینی ئیبراهیمی ملکەچ و
فەرمانبەردار کەوتبێت، کە خودا ئیبراهیمی
کردۆتە خۆشەویستی خۆی و ڕێزداری کردووە.
هەروەها ئەم پێغەمبەرە بەتەنیا ئوممەتێک بووە.
ئەوەتا خودای گەورە دەربارەی دەفەرموێت:
{{إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ
الْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٠﴾ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ اجْتَبَاهُ وَهَدَاهُ إِلَى
صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٢١﴾}}. ألنّحل.
واتە: بەڕاستی ئیبراهیم هەرخۆی ئوممەتێک بوو،
(هەر خۆی پێشەوایەک بوو) ملکەچ و
فەرمانبەرداری خودا بوو و لە هەموو بیر و
باوەڕێکی چەوت بەدوور بوو، لە موشریک و
هاوەڵ پەیداکەران بۆ خودا بە دوور بوو. هەروەها
زۆر سوپاسگوزاری خودا بوو و لە بەرانبەر ناز و
نیعمەتی بێ شوماری پەروەردگاریەوە، ئەویش
هەڵی بژارد و ڕێنموویی کرد بۆ ڕێبازی ڕاست و
دروست.
ئەو سەردەمەی تێیدا لەدایک بوو لەڕوی بیر و
باوەڕەوە
قورئانی پیرۆز باسی لە دایک بوون و باسی ژیانی
سەردەمی منداڵی ئیبراهیم ناکات، هەروەها باسی

ئەوە ناکات لە کوێ لەدایک بووە و بەچ زمانێک قسەی کردووە. بەڵام سەرچاوە عەرەبیەکان وای باس دەکەن کە شوێنی هاتنە دنیای ئیبراهیم لە (بابل)[٧] بووە. مێژوو نووس (یاقوت)[٨] یش لە وەسف کردنی خاکی بابل دا دەڵێت: (کەوتۆتە نێوان دیجلە و فورات) ـەوە و ئەو خاکەیە کە پێی دەگوترێ: سواد. بەڵام قورئان باسی ئەو سەردەمە دەکات بەگشتی کەچۆن خەڵکی لە پەرستنی خودای تاک و تەنیا لایان دابوو و ببونە سێ بەش:
ـ بەشێک بتی جۆرا و جۆریان بەدەستی خۆیان ـ لە دار و بەرد ـ دروست دەکرد و دەیانپەرست.
ـ بەشێک ئەستێرە و مانگ و خۆریان دەپەرست.
ـ بەشێکیش پادشاکان و دەسەڵاتدارەکانیان دەپەرست.
جا لەو ژینگەیەدا کە (فرە خوداوەندی) باڵی بەسەردا کێشابوو ، ئیبراهیم هاتە دنیاوە و خودای پەروەردگار هۆشی ساغ و ڕاستی ی تەواوی پێ بەخشی، ئەویش بە ڕای ڕاست و سرووشی (وەحی) ی پەروەردگاری خۆی زانیبوو کە بێگومان خودا (أللّه) یەکە و هەر خۆی کاربەدەست و دەسەڵاتداری سەر ئەم گەردوونەیە، لەبەر ئەوە دەیەوێت ڕێنمایی گەلەکەی بکات و ڕزگاریان بکات لەو شتە پووچەڵ و بەتاڵانە

بەسەرهاتی) ئیبراهیم بۆ ئەو خەڵکە بگێڕەوە، بەڕاستی ئەو کەسایەتیەکی ن ڕاستگۆ بوو، لە پێغەمبەرانیش بوو. کاتێک بە باوکی گوت: باوکی بەڕێزم! ئەوە تۆ بۆچی شتێک دەپەرستی کە نەگوێ بیستە، نە کەس بەرچاو ڕوون و ڕۆشنبیر دەکات، نە هیچ سوودێکت پێ دەگەیەنێت.

ئەی باوکی بە نرخم! بەڕاستی ئەو زانستی و زانیاریەی کە بۆمن هاتووە (دەربارەی دەسەڵات و توانای بەدیهێنەری ئەم جیهانە) بێگومان بۆ تۆ نەهاتووە، کەواتە پەیڕەوی من بکە ڕێنموویيت دەکەم بۆ ڕێگە و ڕێبازێکی راست و دروست، ئەی باوکی ئازیزم! شەیتان مەپەرستە، چونکە بەڕاستی شەیتان یاخی یە لە خودای میهرەبان و سەرکێشی کردووە. ئەی باوکی بەڕێزم! بەڕاستی من دەترسم سزایەک لەلایەن خودای میهرەبانەوە یەخەت بگرێ، ئەو کاتە ئیتر دەبیتە یار و یاوەر و پشتگیری شەیتان. (باوکی ئیبراهیم بە سەغڵەتیەوە) گوتی: بۆچی ئەی ئیبراهیم! تۆ ئەوەندە لە خوداکانی من بێزاری، بەڕاستی ئەگەر کۆڵ نەدەیت و واز نەهێنیت بێگومان بەرد بارانت دەکەم، بڕۆ دوورکەرەوە لێرە و نامەوێ بتبینمەوە.

ئیبراهیم گوتی: سەلامەت لێ بێت لە مەولا داوای لێخۆشبوون و ( هیدایەتت) لە پەروەردگارم بۆ دەخوازم، چونکە منی خۆش دەوێت، ڕیزی بۆ داناوم. ئەوا ئیدی من دوور دەکەومەوە و کەنارگیری دەکەم لە ئێوە و لەو شتانەی کە لە جیاتی خودا دەیپەرستن، من تەنیا هاوار بۆ پەروەردگارم دەبەم و هەر ئەو دەپەرستم، ئومێدەوارم کە پەروەردگارم نائومێد و ڕەنجەڕۆم نەکات و دوعا و نزا و پەرستنم لێ وەربگرێت.

بێگومان ئیبراهیم (علیه السلام) هەر داوای لێخۆش بوونی بۆ باوکی دەکرد لەبەر بەڵێنێک کە پێشتر پێی دابوو، بەڵام کاتێک بۆی دەرکەوت کە ئەو بەڕاستی دوژمنی خودایە، خۆی لێ بێبەری کرد و وازی لەو پاڕانەوەیە هێنا، وەک خودای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ:

{{وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ إِلاَّ عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ عَدُوٌّ لِلّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لأَوَّاهٌ حَلِيمٌ ﴿١١٤﴾}}. ألتوبة.

ئیبراهیم (علیه السلام) بانگەوازی گەلە بێباوەڕەکەی دەکات

پاشان ئیبراهیم (علیه السلام) کەوتە بانگەوازی گەلەکەی و داوای لێکردن واز لە پەرستنی ئەو

پەیکەرانە بێنن و بانگی کردن بۆ خوداپەرستی کە تەنیا هەر (ألله) خودا و پەروەردگاری جیهانیانە.
خودای گەورە دەفەرموێ:
{{وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ إِبْرَاهِيمَ ﴿٦٩﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُوا نَعْبُدُ أَصْنَامًا فَنَظَلُّ لَهَا عَاكِفِينَ ﴿٧١﴾ قَالَ هَلْ يَسْمَعُونَكُمْ إِذْ تَدْعُونَ ﴿٧٢﴾ أَوْ يَنفَعُونَكُمْ أَوْ يَضُرُّونَ ﴿٧٣﴾ قَالُوا بَلْ وَجَدْنَا آبَاءَنَا كَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴿٧٤﴾ قَالَ أَفَرَأَيْتُم مَّا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٧٥﴾ أَنتُمْ وَآبَاؤُكُمُ الْأَقْدَمُونَ ﴿٧٦﴾ فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّي إِلَّا رَبَّ الْعَالَمِينَ ﴿٧٧﴾ الَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهْدِينِ ﴿٧٨﴾ وَالَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾ وَالَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحْيِينِ ﴿٨١﴾ وَالَّذِي أَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ ﴿٨٢﴾ رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ ﴿٨٣﴾ }}.الشعراء.
واتە: هەروەها بەسەرهات و هەواڵی ئیبراهیم بۆ ئەو خەڵکە باس بکە. کاتێک بە باوکی و بە قەومەکەی گوت: باشە، ئەوە ئێوە چی دەپەرستن؟! گوتیان ئێمە کۆمەڵێک بت دەپەرستین و بەردەوام دەور و خولیان دەدەین. ئیبراهیم گوتی: ئایا کاتێک کە هاناو و هاواریان بۆ دەبەن و دوعا و نزا دەکەن، گوێیان لەئاهـ و ناڵە و داخوازیەکانتان هەیە؟! یاخود دەتوانن ئەوانە

قازانجێک یان زیانێکتان پێبگەیەنن؟! بت پەرستان وەڵامیان دایەوە و گوتیان: (ئێمە ئەوە نازانین)، باو و باپیرانمان دیتووە ئاوایان کردووە (ئێمەش وا دەکەین)...
ئیبراهیم گوتی: باشە نابینن چی دەپەرستن (کەی ئەو شتانە شایستەی پەرستنن). بەڕاستی ئێوەش و باو و باپیرانی دێرینیشتان (بە هەڵەدا چوون). بێگومان هەموو ئەوانە دوژمنی منن، بە دوژمنی خۆمیان دەزانم جگە لە پەروەردگاری جیهانیان. ئەوەی دروستی کردووم هەر ئەو ڕێنموییم دەکات. هەر خۆی خۆراکم پێ دەبەخشێ و تینویەتیم دەشکێنێ. کاتێکیش کە نەخۆش دەکەوم، ئەوە هەر ئەو چارەسەرم دەکات و شیفام بۆ دەنێرێت. هەر ئەویش دەممرێنێت و لەوەودواش زیندووم دەکاتەوە. هەر ئەوە ئومێدم پێیەتی کە لە گوناهم خۆش ببێت لە ڕۆژی قیامەتتدا.....
(ئەوجا ئیبراهیم نزای کرد و گوتی) پەروەردگارا: زانیاری و دانایی و دەسەڵاتی تەواوم پێ ببەخشە و پەیوەستم بکە بە چاکەکارانەوە.
هەر لەو بارەیەوە خودای گەورە لە سورەتی

(العنكبوت) دا دەفەرموێ:
{{وَإِبْرَاهِيمَ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاتَّقُوهُ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ۝١٦ إِنَّمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ أَوْثَانًا وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا إِنَّ الَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ لَكُمْ رِزْقًا فَابْتَغُوا عِندَ اللَّهِ الرِّزْقَ وَاعْبُدُوهُ وَاشْكُرُوا لَهُ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ۝١٧}}.
ألعنكبوت.
واتە: باسی ئیبراهیمیش بکە کە کاتی خۆی بە قەوم و هۆزی خۆی گوت: تەنیا خودا بپەرستن و هەر لەو بترسن، ئەو بیر و باوەڕە چاک و پەسەند و خێردارترە بۆتان، ئەگەر بزانن و تێبگەن.
بەڕاستی ئەو شتانەی کە لە جیاتی خودا دەیانپەرستن تەنیا بت و پەیکەرن، ئێوە بوختان و شتی نابەجێ دروست دەکەن، بێگومان ئەو شتانەی کە لە جیاتی خودا دەیانپەرستن خاوەنی هیچ رزق و رۆزیەک نین بۆ ئێوە، کەواتە هەر داوای رزق و رۆزی لە خودا بکەن، هەر ئەویش بپەرستن، هەر سوپاسگوزاری ئەو بن، بۆ لای ئەویش دەگەڕێنرێنەوە.

ئیبراهیم (علیه السلام) نەخشە دەکێشی بۆ شکاندنی بتەکان
ئیبراهیم (علیه السلام) زۆر ڕقی لەو بت و پەیکەرانە دەبۆوە کە گەلەکەی دەیانپەرست. ئەوە بوو لەدڵی خۆیدا بڕیاری ئەوەی دا بیانشکێنێت، بۆیە لە فرسەتێک دەگەڕا بۆ ئەم مەبەستە.
ئەوەش بۆ ئەوەی بۆ قەومەکەی بسەلمێنێ و بۆیان ئاشکرا بێت کە ئەوانە خودا نین و تێکشکاندنیان ببێت بە بەڵگەیەک کە ئەو بتانە هیچ زەرەر و قازانجێکیان نیە و تەنانەت ئەو بتانە ناتوانن ئازاری هیچ کەسێک بدەن گەر زیانیان لێبدات.
بۆیە ئیبراهیم (علیه السلام) سوێندی خوارد کە بەڵایەک بەسەر ئەم بتانە بهێنێت. خودای گەورە دەفەرموێ:
وَتَاللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَامَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا مُدْبِرِينَ ﴿٥٧﴾. ألأنبياء.
واتە: ئەوجا ئیبراهیم لەبەر خۆیەوە سوێندی خوارد و گوتی: بەخودا نەخشەیەک دەکێشم و داوێک دەنێمەوە بۆ بتەکانتان دوای ئەوەی ئێوە بەجێتان هیشتن و پشتتان هەڵکرد.
ئیبراهیم (علیه السلام) فرسەتێکی باشی بۆ

هەڵکەوت بۆ شکاندنی بتەکان، ئەو فرسەتەش لەڕۆژێکدا بۆی هاتە پێشەوە لە ڕۆژی (جەژنی گەلەکەی)، کە هەموو خەڵکی دەچوونە دەرەوەی شار بۆ ئاهەنگ گێڕان. باوکی داوای لە ئیبراهیم کرد کە بچیت لەگەڵیاندا بۆ دەرەوەی شار بۆ ئاهەنگ گێڕان، (ئیبراهیم) یش بۆ ئەوەی خۆی دوا بخات و نەچێت لەگەڵیان، ئەوەبوو تەماشایەکی ئەستێرەکانی کرد و گوتی: (من لە دەرکەوتنی ئەستێرەدا ئەوە دەخوێنمەوە کە من دەردەدار بووم). {{فَنَظَرَ نَظْرَةً فِي النُّجُومِ ۝٨٨ فَقَالَ إِنِّي سَقِيمٌ ۝٨٩}}. ألصافّات.
خەڵکەکە وا تێگەیشتن کە ئیبراهیم تووشی نەخۆشیەکی خراپ بووە، بۆیە دەستبەجێ بەجێیان هێشت بۆ ئەوەی نەخۆشییەکە ئەوانیش نەگرێتەوە.
دوای ڕۆیشتنی خەڵکەکە کەوتە ڕێ بۆ لای بتەکان بە مەبەستی تێکشکاندنیان، کە چووە ناو هۆڵەکەی پەیکەرەکانی تێدابوو دیتی خواردنێکی زۆر لە بەردەمی بتەکان داندراوە (وا پێدەچێت بەنیازی قوربانی و خۆ لێ نزیک کردنەوەیە لەم بتانە ـ بە بۆچوونی خۆیان ـ). ئیبراهیم (علیه السلام) کە خواردنەکانی دیت، کەوتە گاڵتە

پێکردن بە پەیکەرەکان پێی گوتن: ئەوە بۆ ناخۆن؟ بۆ هیچ کامتان وەڵام ناداتەوە؟... ئەوجا بەدەستی ڕاستی هەموویانی بە تەورێك شکاند و ورد و خاشی کردن. خودای گەورە دەفەرمویٚ:
{{فَرَاغَ إِلَى آلِهَتِهِمْ فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ۝{٩١}۝ مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ ۝{٩٢}۝ فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًا بِالْيَمِينِ ۝{٩٣}۝}}. ألصّافّات.
ئیبراهیم (علیه السلام) تەنیا یەک بتی هێشتەوە ئەویش لە وانی دیکە گەورەتر بوو ( واتە گەورەترین خواوەندیان)، ئەوجا تەورەکەشی پێیدا هەڵپەسارد: {{فَجَعَلَهُمْ جُذَاذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ۝{٥٨}۝}}. ألأنبياء. واتە: هەموو بتەکانی ورد و خاش کرد جگە لە گەورەکەیان، بەڵکو کە گەڕانەوە (پرسیار بکەن) و ئیبراهیم ڕاستیان بۆ ڕوون بکاتەوە.
ئەوەی ئیبراهیم کردی لەگەڵ پەیکەرەکان گەورەترین بەڵگەیە بۆ گەلەکەی کە ئەگەر ئەم بتانە خواوەندێکی ڕاستەقینە بوونایە و شایانی ئەوە بوونایە خەڵکی بیانپەرستن ئەوا دەبوایە بەرگرییان لە خۆیان بکردایە و زیانیشیان بە هەرکەسێک بگەیاندایە کە نیازی خراپی بەرامبەریان هەبوایە..



## دادگایی کردنی ئیبراهیم (علیه السلام)

دوای ئەوەی کە کۆتایی بە ئاهەنگ گێڕان هات و خەڵکەکە گەڕانەوە ناو شار دیتیان بتەکانیان چی بەسەر هاتووە. گوتیان: ئەریٚ ئەوە نازانن چ ستەمکارێک ئاوهای لە خوداکانمان کردووە؟ هەندیکیان وەڵامیان دایەوە و گوتیان:
بیستوومانە کە کوڕیکی گەنج بە ناوی ئیبراهیم کە هەردەم تانە و تەشەر لە خوداکانمان دەدات و بە خراپە باسیان دەکات، هەر ئەویشە گومانی ئەو کردارەی لیٚ بکەین....... خودای گەورە دەفەرمویٚ:
{{قَالُوا مَن فَعَلَ هَذَا بِآلِهَتِنَا إِنَّهُ لَمِنَ الظَّالِمِينَ ﴿٥٩﴾ قَالُوا سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ ﴿٦٠﴾ قَالُوا فَأْتُوا بِهِ عَلَى أَعْيُنِ النَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ ﴿٦١﴾ قَالُوا أَأَنتَ فَعَلْتَ هَذَا بِآلِهَتِنَا يَا إِبْرَاهِيمُ ﴿٦٢﴾ قَالَ بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَذَا فَاسْأَلُوهُمْ إِن كَانُوا يَنطِقُونَ ﴿٦٣﴾}}. ألأنبياء.
واتە: بت پەرستەکان (کە هاتنەوە دیتیان بتەکانیان ورد و خاش کراوە) گوتیان: ئەوەی ئەمەی کردووە بە خوداکانمان، بەڕاستی لە ستەمکارانە!! هەندیکیان گوتیان: بیستوومانە لاوێک بە خراپە باسیان دەکات، پێی دەڵێن ئیبراهیم.

گوتیان کەوابوو بیهێنن بە بەرچاوی خەڵکەوە (موحاسەبەی بکەین و لێی بکۆڵینەوە) با ئەوانیش ئاگادار بن و ببینن. (چوون ئیبراهیمیان هێنا و لێیان پرسی) گوتیان: باشە، ئەی ئیبراهیم ئایا تۆ ئەوەت کردووە بە خوداکانمان؟! ئیبراهیم گوتی: (بۆچی لەمن دەپرسن، خۆ بتە گەورەکە ساغ و سەلیمە) نەخێر؛ هەر کاری ئەو بتە گەورەیەیە، دە لێیان بپرسن گەر ئەوان قسە دەکەن!! ئەوەش شێوازێکی دانایانەیە وەڵامی پرسیارەکانیان بەو جۆرە دەداتەوە.
مەبەستی ئیبراهیم لێرەدا وا دەگەیێنێ کە(بتی گەورە) تووڕە بووە لەوەی کە شان بە شانی ئەو، ئەو هەموو بتە گچکانە بپەرستن و لەکاتێکدا ئەویش لە هەموویان گەورەتر بێت، هەربۆیە شکاندوونی).
( کەمێک داچڵەکان) و لەدڵی خۆیاندا لێکیان دەدایەوە، سەرئەنجام گوتیان بەخۆیان: بەڕاستی هەمیشە ئێوە ستەمکارن (ئیبراهیم ڕاست دەکات، ئەوانە ناتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن چۆن دەتوانن بەرگری لە ئێمە بکەن):
{{فَرَجَعُوا إِلَى أَنفُسِهِمْ فَقَالُوا إِنَّكُمْ أَنتُمُ الظَّالِمُونَ ﴿٦٤﴾}}. ألأنبياء.

پاشان بە سەرشۆڕی پاشگەزکرانەوە بۆ بیر و باوەڕە کۆنەکەیان گوتیان: بێگومان تۆ زانیووتە کە ئەوانە قسە ناکەن و تێ ناگەن!! (ئیتر چۆن داوامان لێ دەکەیت پرسیاری ئاخاوتنیان لێ بکەین بۆمان بدوێن دەربارەی ئەوەی بەسەریاندا هێنراوە؟):
{{ثُمَّ نُكِسُوا عَلَى رُؤُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَؤُلَاء يَنطِقُونَ ۝{٦٥}}}. ألأنبياء.
ئیبراهیم (علیه السلام) فرسەتی باشی دەستکەوت تاوەکو لە بەردەم ئەو حەشامەتی خەڵکەدا بانگەوازەکەی ڕوون بکاتەوە، گوتی: باشە، ئاخر، جۆن شتێک دەپەرستن لەباتی خودا کە ناتوانێت هیچ جۆرە قازانجیکتان پێبگەیەنێت یان هیچ جۆرە زیانێکتان لێدوربخاتەوە! ئۆف لەدەست ئێوە و لەدەست ئەو شتانەش لەباتی خودا دەیانپەرستن، مەگەر بیر و هۆشتان بۆ نەخەنە کار؟! :
{{قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْئًا وَلَا يَضُرُّكُمْ ۝{٦٦} أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ۝{٦٧} }}. ألأنبياء.
ئەم ئایەتە لە هەر چاخ و سەردەمێکدا بێ نرخی و نەفس نزمی ی ئەوانە دەردەخات کە بت و

پەیکەرەکان بە پیرۆز دادەنێن و لەباتی خودای گەورە دەیانپەرستن. بەڵام ئەگەر نەفامی (جهل) لە دەروونی خەڵکیدا خۆی بچەسپێنێت و دەمارگیری ی کویرانەش دڵان داگیرکات ئیتر دەروونەکان دەگەنە ئاستێکی بێزراو لەهەڵسەنگاندنی باری ڕاستی ی شتەکان. لەبەر ئەوە کاتێک لەبەرانبەر ڕوون کردنەوەکانی ئیبراهیم پێغەمبەردا هیچیان پێ نەما (وەک عادەتی هەموو ستەمکارێک کاتێک توانای موناقەشەی نامێنێ و هیچ بەڵگە و بیانوویەکی بەدەستەوە نامێنێ، یەکسەر واز لە وت و وێژ و مناقەشەی بەرانبەر دێنیت و پەنا دەباتە بەر زەبر و زۆر و ترساندن).

بڕیاری سووتاندنی ئیبراهیم (علیه السلام)

خودای گەورە دەفەرموێ:

{{قَالُوا حَرِّقُوهُ وَانصُرُوا آلِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَاعِلِينَ ﴿٦٨﴾}}. ألأنبياء

واتە: هەندێکیان گوتیان: ئیبراهیم بسووتێنن و پشتیوانی لە خوداکانتان بکەن، ئەگەر ئێوە شتێکتان بۆ دەکرێت.

هەروەها خودای گەورە دەفەرموێ:

{{قَالُوا ابْنُوا لَهُ بُنْيَانًا فَأَلْقُوهُ فِي الْجَحِيمِ ﴿٩٧﴾ }}. ألصافات.

واتە: گوتیان شوێنێک دروست بکەن و ئاگری تێدا بکەنەوە و ئیبراهیمی تێ فڕێ بدەن.
بت پەرستان کاتێک دیتیان گلۆڵەیان دە کەوێتە لێژی و پەردە لەسەر ڕوویان هەڵدەماڵرێت و هیچ بەڵگەو و بیانوویەکیان بە دەستەوە نامێنێت، یەکسەر واز لە وت و وێژ و موناقەشە لە گەڵ ئیبراهیم دێنن و پەنا دەبەنە بەر ئەو هێزەی کە ڕیسوایی و شەرمەزاری یەکانیان بۆ دادەپۆشێت.

گوتیان ئیبراهیم دەبێ سزا بدرێت، بەڵام بەچ شێوەیەک؟! گوتیان باشتر وایە حوکمی سووتاندنی بدەین، یەکێک لە بێ باوەڕەکان گوتی: ئاگرێکی گەورەی بۆ سازبکەن و منیش (مەنجەنیقێکی) گەورە دروست دەکەم بۆ ئەوەی بەو مەنجەنیقە فڕێی بدەنە ناو ئاگرەکە [٩].
پێشنیارەکە پەسند کرا، لە شیوێکی نێوان دوو شاخ دا [١٠]. دەست کرا بە کۆکردنەوەی دار، خەڵکەکە هەموویان کەوتنە دار کۆکردنەوە و دارێکی زۆر کۆکرایەوە، تەنانەت ئافرەتی نەخۆش نەزری دەکرد لە سەر خۆی ئەگەر لە نەخۆشیەکەی چاک ببێتەوە و دەبێت چەند کۆڵ دار کۆبکاتەوە بۆ ئاگرەکەی ئیبراهیم!!. [١١]. ئاگرەکە کرایەوە و

ئیبراهیم پێغەمبەریان خستە ناو دەسکی
مەنجەنیقەکە. لەو کاتەدا مەنجەنیق هاوێژرا،
ئیبراهیم (علیه السلام) فەرمووی: حَسْبُنَا اللَّهُ
وَنِعْمَ الْوَكِيلُ [١٢]....واتە: خودامان بەسە کە
یاریدەدەر و یارمەتیدەریکی چاکە. خودای گەورە
بە قودرەت و توانای خۆی ڕزگاری کرد لە سووتان
و فەرمانی ساردی و سەلامەتی بە ئاگرەکەش کرد
و پێی فەرموو:
قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَامًا عَلَى إِبْرَاهِيمَ ۝٦٩ }}.
ألأنبياء.
ئاگرەکەش بەفەرمانی خودا سارد و سووک و
ئاسان بوو لەسەری، واتە هێندەش ساردنەبۆوە کە
سەرمای ببێت.
باسی (مونازەرەی) نێوان ئیبراهیم (علیه السلام)
و نەمرود
لەو سەردەمەدا پادشایەک هەبووە بەناوی
(نمرود). ئیددیعای خودایەتی و پەرستراوێتی بۆ
خۆی کردووە. ئەو پادشایە بیستبووی کەوا
(ئیبراهیم) بانگەواز بۆ پەرستنی خودای تاک و بێ
هاوەڵ دەکات و کە هیچ پەرستراوێکی دیکە نیە
جگە لە (اللّٰه). بۆیە ئەم پادشایە دەنێرێ بە دوای
(ئیبراهیم) دا و لەگەڵیدا دەکەوێتە گفتوگۆ بەم
شێوەی کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە:

{{أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِي حَآجَّ إِبْرَاهِيمَ فِي رِبِّهِ أَنْ آتَاهُ اللّهُ الْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّيَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا أُحْيِي وَأُمِيتُ قَالَ إِبْرَاهِيمُ فَإِنَّ اللّهَ يَأْتِي بِالشَّمْسِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ الْمَغْرِبِ فَبُهِتَ الَّذِي كَفَرَ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿٢٥٨﴾}. ألبقرة.

واته: ئایا نەتبیستووە و نەتڕوانیوەتە ئەو کەسەی دەمەقاڵەی لەگەڵ ئیبراهیمدا لەبارەی پەروەردگاریەوە لەبەر ئەوەی خودا پادشایەتی پێبەخشی بوو، (لەجیاتی باوەڕهێنان و سوپاسگوزاری کەچی دەمە دەمێی دەکرد لەگەڵ ئیبراهیمدا). (ئەم لووت بەرزیەش کاتێک بوو بە هەواو فیزەوە پرسیویەتی لە ئیبراهیم کە خودای تۆ کێیە)؟ ئیبراهیم وەڵامی داوەتەوە: خودای من ئەو خودایەیە کە ژیان دەبەخشێت و مردنیشی بەدەستە (خودای پاک و بێ خەوش بناغە داڕێژەی ژیان و بەدی هێنەریەتی، هەر ئەویش بە فیعلی ژیان لە مرۆڤ دەستێنێتەوە. بەڵام پادشای ـ فریو خواردوو بەهێزی خۆی ـ بەجۆرێک نکووڵی لێ کرد) کە گوتی: من خەڵکی دەژیەنم و دەیانمرینم:

(دوو پیاو کە شایەنی کوشتنن دێنم و یەکێکیان
دەکوژم و بەو کوشتنەکەشی مانای وایە
مراندوومە، پیاوی دووەمیش لێی دەبوورم و
نایکوژم و بەمەش مانای وایە ژیاندوومە)!!
[١٣]....« بێگومان ئەم قسەیەی پادشاکە بە هەڵەدا
چوون و شێواندنی حەقیقەتە چونکە کرداری
ژیاندنی ڕاستەقینە تەنها بە هینانە ئارای
مەخلووقێکی زیندوو لە نەبوو (عدم) ـەوە
دەبێت. لەبەر ئەوەش دەبینین ئیبراهیم (علیە
السلام) لەسەر ئەو ووتەیەی پادشا کە پێویستی ی
بە ژیربێژی (منطق) ـە، مشتومڕی لەگەڵدا ناکات،
بەڵام بۆ یەکلایی کردنەوە و بڕاندنەوەی ئەو
مشتومڕە و دەم کوت کردنی پادشاکە ڕێگەیەکی
بەسوودتر و پتەوتر دەگرێتە بەر» و پێی دەڵێ:
بەڕاستی خودا خۆر لە ڕۆژهەڵاتەوە دەهێنیت جا
(ئەگەر تۆ دەتوانیت) لە ڕۆژئاواوە بیهێنە [*]،
ئینجا ئەو بێ باوەڕە ڕەنگی پەڕی و دەمکوت کرا
و وەڵامی نەما، بێگومان خودا هیدایەتی قەومی
زاڵم و ستەمکار نادات.
سەرئەنجامی مل ملانێ کە

خودای گەورە دەفەرموێ:
{{فَأَرَادُوا بِهِ كَيْدًا فَجَعَلْنَاهُمُ الْأَسْفَلِينَ ﴿٩٨﴾}}.
ألصافّات.
واتە: ئەوان ویستیان پیلانێکی بۆ دروست بکەن، ئیمە ئەوانمان تێکشکاند و ڕیسوامان کردن.
• تێکشکان و ڕیسوا بوونیان لەبەر ئەم هویانە بوو: بتەکانیان کە بە خودا ناویان دەبردن، تێک شکێنران و نەیان توانی بەرگری لە خۆیان بکەن. • فێڵ و سزاکەیان کە بۆ سوتاندنی ئیبراهیم (علیە السلام) سازیان کرد پوچەڵ کرایەوە. • دەسەڵات داران و بتەکانیان لە بەرچاوی خەڵکی سووک بوون، ئیبراهیم و خوداکەی سەرکەوتن. • لە مونازەرەکەی نێوان ئیبراهیم (علیە السلام) و نەمرود پادشادا نەمرود دەم کوت بوو و هیچی پێنەما. • نەمرود دڵنیا بوو لە بەدەسەڵاتی پەردوەردگاری (ئیبراهیم)، زانی هیچ شتیکی پێ ناکرێ دژی ئیبراهیم.

ئەو دوژمنایەتی یە سەخت و توند و تیژەی بت پەرستان بوو بەرامبەر ئیبراهیم و ئەو چەند کەسە ئیماندارەی لەگەڵی دابوون، بووە هۆی کۆچ کردنی ئیبراهیم بەرەو (شام), خۆی و لەگەڵ (لوط) و چەند کەسێک لەوانەی کە باوەڕیان پێ هێنابوو.
هەروەک قورئانیش ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە:
{{فَآمَنَ لَهُ لُوطٌ وَقَالَ إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَى رَبِّي إِنَّهُ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٢٦﴾}}. ألعنكبوت. واتە: ئینجا (لوط) باوەڕی پێ هێنا، ئیبراهیم (دوای ئەوەی کە نائومێد بوو لە قەومەکەی) گوتی: بەڕاستی من ئیتر کۆچ دەکەم بۆلای پەروەردگارم (بۆ ئەو شوینەی کە ئەو بۆم دیاری دەکات)، هەر خودای پەروەردگاریشمە بە دەسەڵات و دانایە. خودای گەورە ستایشی ئەو هەڵوێستەی(ئیبراهیم)ی کردووە و دەفەرموێ:
{{قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَاء مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاء أَبَدًا حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَا أَمْلِكُ لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن شَيْءٍ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ﴿٤﴾}}. ألممتحنة.

واتە: ئەی ئیمانداران، بەڕاستی لە ئیبراهیم و
ئەوانەی لەگەڵیدا بوون نموونەیەکی چاکتان
خراوەتە بەرچاو، کاتێک کە بە قەومەکەی
خۆیانیان گوت: دوای ساڵەها بانگەواز ئێمە بەرین
لە ئێوە و لەو شتانەش کە لەجیاتی خودا
دەیپەرستن، ئێمە باوەڕمان بەو دین و ئاینەی ئێوە
نیە، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لەنێوانماندا
بەرپا بووە تا ئەو کاتەی کە باوەڕ بەخودای تاک و
تەنیا نەهێنن، جگە لەو بەڵێنەی ئیبراهیم دای بە
باوکی و گوتی: بێگومان داوای لێ خۆشبوونت بۆ
دەکەم، دەسەڵاتی خوداشم نیە ئەگەر کارەساتێکت
بەسەر بهێنێت، ئەوجا گوتی: خودایە، هەر پشتمان
بەتۆ بەستووە و هەر بۆ لای تۆش گەڕاوینەتەوە،
سەرەنجامیش هەر بۆ لای تۆیە.
ئەوجا بە فەرمانی خودای گەورە ئیبراهیم (علیه
السلام) و ئەو باوەڕدارانەی باوەڕیان پێ هێنابوو،
کۆچیان کرد بۆ شام و لەشاری (حەڕان)ی ئەو
سەردەمە نیشتەجی بوون. هەر دوای نیشتەجێ
بوونیان بە ماوەیەک ئیبراهیم (علیه السلام) کچی
پادشای (حەڕان)ی خواست کە ناوی (سارە) بوو و
کردی بە هاوسەری. [١٤] لە شاری (حەڕان)یشدا
کەوتە بانگەوازی یەکتاپەرستی.چونکە هەردەستە

و تاقمێک لە خەڵکی ئەو شارەشتێکیان دەپەرست، وەک ئەستێرە و مانگ وخۆر.قسە کردن لەگەڵ ئەوانەی خۆر و مانگ و ئەستێرەیان دەپەرست هەوەکوو لەپێشەوە باس کرا، لەو ژینگە و زەمەنەی کە ئیبراهیم (علیە السلام) تێدا ژیاوە خەڵکانێک (خۆر و مانگ و ئەستێرە) شیان پەرستووە. ـ ئیبراهیم ـ یش (علیە السلام) وەک پێغەمبەرێک کە لەلایەن خودای گەورەوە نێردرابوو بۆ ئەوەی بانگەوازی خەڵکی بکات بۆ ڕێگەی ڕاست، لەگەڵ ئەوانیش کەوتە ووت و وێژ بۆ ئەوەی بۆیان ڕوون بکاتەوە هەتا چ ڕادەیەک ئەوان لەگومڕاییدا دەژین و بۆیان دەربخات کە پەرستراوی ڕاستەقینە هەر خودای تاک و تەنیایە.
لەم بارەیەوە خودای گەورە دەفەرموێ:
{{وَكَذَلِكَ نُرِي إِبْرَاهِيمَ مَلَكُوتَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ الْمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَأَى كَوْكَبًا قَالَ هَذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لا أُحِبُّ الآفِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَأَى الْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِي رَبِّي لأكُونَنَّ مِنَ الْقَوْمِ الضَّالِّينَ ﴿٧٧﴾ فَلَمَّا رَأَى الشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَذَا رَبِّي هَذَآ أَكْبَرُ فَلَمَّا أَفَلَتْ قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٧٨﴾ إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ

السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿٧٩﴾ }}. ألأنعام مانا و شیکاری ئایەتەکان :
بێگومان خودا هەندێک لەو نهێنی یانەی (موڵکی گەورە و گەردوونی بەرفراوانی ژێر دەسەڵاتی خۆی) کە بەڵگەن لەسەر پەروەردگارێتی یەکەی، پێشانی (ئیبراهیم) دەدا بۆ ئەوەی بەڵگە بەدەست بێت و لەڕیزی دڵنیاکاندا بێت. ئینجا کاتیک شەو باڵی کێشا بەسەر ئیبراهیمدا، ئەستێرەیەکی (گەشی گەورەی ) بینی، بۆیە گوتی: ئاگاداربن، وادابنێین ئەوە پەروەردگارمە، کاتێک ئەستێرەکەی لێ ئاوا بوو گوتی: من شتی لەبەرچاو گوم بووم خۆش ناوێت و ناپەرستم ـ بەمانای: من باوەڕ بە پەرستراوێک ناهێنم کە دەرکەوێت و پاشان بزر بێت ـ (ئەمەش شێوازێکی دانای یە کە ئیبراهیم هەڵی بژاردووە، ئەو لەو شێوازەیدا پەرستراوەکانیانی بە سووک و بێ نرخ دانەناوە و بیر و باوەڕەکانیشیانی لە سەرەتادا بە خراپ و ناهەموار لە قەڵەم نەداوە نەبادا لێ ی بتەکنەوە و دژایەتی بکەن و گوێی لێ نەگرن).
ئەوجا کاتێک مانگی بینی هەڵهات، گوتی ئاگاداربن، وادابنێین ئەوەیان پەروەردگارمە، کاتێک ئەویش

ئاوا بوو گوتی: سوێند بێت بە خودا ئەگەر پەروەردگارم هیدایەتی نەدامایە، ئەوە بێگومان لەڕیزی دەستەی گومڕاکاندا دەبووم. ( لێرەدا دوو ئامانجی ڕەچاو کردووە، یەکەم: پووچەڵ کردنەوەی پەرستنی مانگ. دووم: بەڵام لە ڕاستیدا پەرستراوێکی دیکە هەیە کە خودا (أَللّٰه) ی تاک و تەنیا و بێ هاوەڵە). ئەوجا کاتێک خۆری بینی هەڵهات، گوتی: ئاگاداربن وادابنێین ئەوەیان پەروەردگارمە، ئەوە گەورەتریشە، کاتێک ئەویش ئاوابوو گوتی: ئەی خەڵکینە، ئەی خزمینە، بەراستی من بەریم لەو شتانەی ئێوە کردووتانە بە هاوەڵ و شەریک (بۆ پەروەردگار). بەڕاستی من ڕووی خۆم و دڵم لە پەرستندا کردۆتە ئەو زاتەی ئاسمانەکان و زەوی فەراهەم هێناوە، لە کاتێکدا ڕووم لە هیچ شتێکی دیکە ناکەم، بە دڵئارامی تەواویشەوە (دەڵێم کە): هەرگیز من لە ڕیزی موشریکاندا نیم و هاوەڵ بۆ خودا دانانێم.

کۆچ کردن بۆ میسر (مصر)

ماوەیەک لە وڵاتی شام مانەوە، پاشان گرانی پەیدا بوو، ئەوێشیان جێهێشت و بەرەو وڵاتی میسر کەوتنە ڕێ و لەوێش ماوەیەک مانەوە.

گەڕانەوە بەرەو فەلەستین وخودای گەورە ئیسماعیل بە ئیبراهیم دەبەخشێ ئیبراهیم لە

(میسر)ەوە بەرەو (فەلەستین) کەوتە ڕێ، سارەی
خێزانی لەگەڵدا بوو هەروەها کەنیزە (جاریە)
یەکی  سارەشیان لەگەڵ دابوو بەناوی (هاجەر).
دوای ماوەیەک لە نیشتەجێ بونیان ئیبراهیم
(لوط)ی برازای نارد بۆ شاری (سەدوم)، کە
ئێستاکە کەوتۆتە بەشی باشوری خۆرئاوای دەریای
مردوەوە (البحر المیت).
ئیبراهیم (علیە السلام) زۆری پێ خۆش بوو کەوا
خودا کوڕێکی صالح و چاکی پێ ببەخشێت
دوعای کرد و فەرمووی:
{{رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ ﴿١٠٠﴾}}. ألصافّات.
واتە: خودایە نەوەیەکی چاک و پاکم پێ ببەخشە.
وادیاربوو (سارە)ی هاوسەری لە ئیبراهیم
گەیشتبوو کە زۆری ئارەزوو هەیە خودا کوڕیکی
بداتێ، دەشی زانی کە خۆی مندالی نابێ، چونکە
ژنیکی بە ساڵاچوو و بە تەمەن و هەروەها
نەزۆکیش بوو و بەتەمای ئەوە نەبوو مندالّی
ببێت، بۆیە داوای لە ئیبراهیم کرد کە - هاجەر - ی
کەنیزەی بخوازێ بەڵکو خودا کوڕێکی بداتێ.
هاجەر بوو بە خێزانی ئیبراهیم، هێندەی پێنەچوو
دووگیان بوو، مندالێکیان بوو ناویان نا
(ئیسماعیل).

کۆچ کردنی ابراهیم علیه سلامو هاجەر و کۆرپەکەیان بۆ دۆڵی (مەککە) دوای ماوەیەک پەژارە و حەسوودی لە دەروونی (سارە) دەبزوێت لە بەر ئەوەی هاجەر کوڕی بوو و ئەویش بەساڵاچوو و نەزۆک بوو، داوای لە ئیبراهیم کرد کە (هاجەر و ئیسماعیل)ی کوڕی دوورخاتەوە چونکە وای لێ هاتبوو کە نەیدەتوانی ژیان لەگەڵ (هاجەر)دا بەسەر بەرێت. لەم لاشەوە خودای گەورە وەحی بۆ دەنێرێت کە دەبێت (هاجەر) و (ئیسماعیل) لە گەڵ خۆیدا ببات بۆ (مەککە).
ئیبراهیم (علیە السلام) ئەو منداڵە و هاجەری بۆ سەفەر سازدا و لەگەڵیاندا کەوتە ڕێ.
چەندین ڕۆژ بەڕێگەوە بوون تەنها خواست و ئیرادەی خودای گەورە ڕێگەی پێشان دەدا، هەتاخودای گەورە فەرمانی پێدا بەڕاوەستان لە خاکێکی چۆڵی دوور لەئاوەدانی، واتە لەو جێگەیەی کە دەبوو لە ئایندەیەکی نزیکدا ماڵی خودا (البیت الحرام)ی تیادا بنیات بنرێ. ئیبراهیم (هاجەر و ئیسماعیل)ی گەیاندە ئەو جێگە وشک و چۆڵاییەی نە ئاوی لێ بوو نە دار و درەخت، تووورەگەیەک خورما و جەوەندەیەک ئاوی بۆ بەجێ هێشتن و بەشوێنی خۆیدا گەڕایەوە.

هاجەر بانگی لێ کرد و گوتی: بۆکوێ دەچی؟ چۆن
لەو دۆڵە چۆڵ و وشکەدا بەجێمان دێڵیت؟..چەند
جار ئەم پرسیارانەی لێ دووبارە دەکردەوە بەڵام
ئیبراهیم هەر بەبێ دەنگی ڕێگەی گرتبووە بەر و
دەڕۆیشت. ئەوجا هاجەر لێی پرسی: ئایا خودا
فەرمانی پێ کردوویت؟ ئەمجارە ئیبراهیم وەڵامی
دایەوە و گوتی: بەڵێ!! هاجەر حاڵی بوو کە ئەوە
کاری خودایە بۆیە بەدڵنیییای یەوە گوتی: کەوابوو
خودا فەرامۆشمان ناکات..
ئیبراهیم (علیه السلام) جێی هێشتن و ڕۆیشت،
هەرچەندە زۆر لەدڵی گران بوو کەوا (هاجەر و
ئیسماعیل)ی کوڕی کە شیرەخۆرە بوو بە تەنیا لەو
چۆڵ و بیابانە جێ بێڵێت، بەڵام خواستی خودای
گەورە لەسەرووی خواستی ئیبراهیمەوە بوو.
تاوەکوو لەگردۆڵەکان وون بوو و ئەوانی لێ دیار
نەما، ئەوجا ڕووی کردە ئەو جێگەیەی کە
(لەدواییدا کەعبەی لێ بنیات درا)، لە خودا
پاڕایەوە و ئەو دوعایەی کرد کەقورئانی پیرۆز
بۆمان دەگێڕێتەوە:{رَّبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي
بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ
الصَّلاَةَ فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِّنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ
وَارْزُقْهُم مِّنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ ﴿٣٧﴾ رَبَّنَا إِنَّكَ

تَعْلَمُ مَا نُخْفِي وَمَا نُعْلِنُ وَمَا يَخْفَى عَلَى اللّهِ مِن شَيْءٍ فَي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاء ﴿٣٨﴾}}. إبراهيم
مانا و شیکاری ئایەتەکان: خودایە ئەوا من هەندێک لە وەچە و خێزانم لە دۆڵێکی وشکی بێ کشتوکاڵدا جێنشین کردووە؛ لەلای ئەوماڵەتەوە (کە لەمەو لا بۆت بنیاد دەنێم و کەڕیز و بەهای گەورەی دەبێت و کەس ناتوانێت بە چاوی بێ حورمەتی و سووک بۆی بڕوانێت)!! خودایە بۆیە لێرە نیشتەجێم کردن تا بەچاکی نوێژ و خودا پەرستی ئەنجام بدەن، جا داواکارم دڵی هەندێک لەو خەڵکە کەمەندکێش بکەیت بۆ لایان و لە ڕزق و ڕۆزی جۆرا و جۆر بەهرەمەندیان بکەیت، تاکو سوپاسگوزاری بکەن. خودایە، تۆ لە نهێنی و ئاشکرامان ئاگاداریت (لەکار و کردەوەمان) و هیچ شتێک لە زەوی و لە ئاسماندا لە خودای گەورە پەنهان نابێت.
هاجەر و کوڕەکەی بەتەنها مانەوە لەو دەشتە چۆڵە بێ ئاوە، بەردەوام شیری دەدا بە کوڕەکەی و لەو ئاوەشی دەخواردەوە کە ئیبراهیم (علیه السلام) بۆی بەجێ هێشتبوو، پاش ماوەیەک جەوەندەکە ئاوی تێدا نەما، زۆری پێ نەچوو خۆی و کوڕەکەی تینوێتی زۆری بۆ هێنان بەڵام (هاجەر) زیاتر بێ تاقەتی کوڕەکەی بوو و ئەو دیمەنە

دڵتەزێنەی کوڕی کە ڕادەچڵەکی لە تینوان دا زۆر لەلا ناخۆش بوو، خۆی بۆ ڕانەگیرا و لەو ناوەدا کەوتە گەڕان و نەی دەزانی ڕوو لەکوێ بکات، نزیکترین شوێن لێیەوە تەپۆڵکەیەکی بڵند بوو کە بە (صفا) ناسراوە، یەکسەر ڕای کرد بۆی و چووە سەری و ڕوانیە دەور وبەری بەڵام هیچ کەسی بەدی نەکرد، پاشان هاتە خوارەوە بە گورگە لۆقە (هرولە) دامێنی کراسەکەی هەڵکردبوو شیوەکەی بڕی و چووە سەر تەپۆڵکەکەیەکی دیکە کە بە (مڕوە) ناسراوە، لەوێش زۆری ڕوانی هیچ کەسی بەدی نەکرد، دیسان بەهەمان شێوە شیوەکەی بڕی و گەڕایەوە بۆ (صفا). ئەم هات و چۆیەی نێوان (صفا) و (مڕوە) حەوت جاری خایاند (١). ((بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی (سعی) بەینی سەفا و مەڕوە کرتەیەک لەسەر بکە)).

بیری زەمـــزەم (زمزم)

پاشان لەسەر (مەڕوە)وە دەنگێکی بیست، لەبەر خۆیەوە بەخۆی گوت: ئا بێدەنگ بە، جارێکی دیکەش دەنگەکەی بیستەوە کە ئاوڕی بۆ دایەوە دیتی فریشتەیەک (لە مەوقیعی زەمزەم) بە پاژنەی پێی یا بەباڵەکانی کێشا بە زەویدا و یەکسەر ئاو لەو جێگەیە هەڵقوڵا، فریشتەکە پێی گوت: مەترسن، ئێوە زایە نابن، ئائەوە ماڵی

خودایە (ئامାژەی بۆ تەپۆڵکەیەکی نزیکی کرد، کە ئاوی باران لەم لاو ئەو لای کەم کردبۆوە)، فریشتەکە بەردەوام بوو و گوتی: ئەم کوڕە و باوکی لێرە ماڵی خودا دروست دەکەن [١٥].
هاجەر لە خۆشیاندا بەدەست ئاوەکەی کۆ دەکردەوە و نەیهێشت جۆگەلە بکات، گۆمیلکەی بۆ کرد و جەوەندەکەی لێ پڕ کرد. پێغەمبەر (درود و سەلامی خودای لەسەر بێت)فەرموویە: (خودا ڕەحم بەدایکی ئیسماعیل بکات ئەگەر وای نەکردایە و لێ بگەڕایە ئاوی زمزم بڕۆشتایە، ئێستا زمزم سەرچاوەیەکی ڕەوان دەبوو). هاجەر تێر ئاوی خواردەوە و شیری دا بە منداڵەکەی.
هۆزی جورهوم
خێڵێکی عەرەب کەناویان (جورهوم) بوو کاروانێکیان لە نزیک ئەو شوێنەوە دەڕۆیشتن لە خوارووی مەککە لایان دابوو. دیتیان باڵندە بەسەر ئەو ناوچەیەدا دەسووڕێتەوە، گوتیان: ئەو باڵندانە بەسەر ئاوێکدا دەسووڕێنەوە، ئەوەندەی ئێمە ئاگادار بین لەم دۆڵەدا ئاو نەبووە، کەسێکیان نارد بۆ زانینی هەواڵەکە و گەڕایەوە بۆ لایان و مژدەی بوونی ئاوی پێدان. پاشان کاروانەکە چوون بۆ لای (هاجەر) و پێیان گوت: ئایا ڕێگەمان پێ دەدەیت ئێمەش لێرەدا نیشتەجێ ببین؟ گوتی: باشە، بەڵام

مافی تەسەرروفی ئاوەکە بەدەست خۆمەوەیە(٢).
کاروانیەکان هەواڵیان نارد بۆ خێزانەکانیان کە بەرەو مەککە بکەونە ڕێ. ئیتر ئەو هۆزە واتە هۆزی (جورهوم) لەو شوێنە جێ نشین بوون.
ئیسماعیل لەوانەوە فێری زمانی عەرەبی بوو، وە لەناویاندا گەورە بوو و ئافرەتێکی (جورهومی) کرد بە هاوسەری خۆی.
پێغەمبەرێتی ی "ئیسماعیل" خودای گەورە بەدەقیکی قورئانی ئاماژەی بۆ پێغەمبەرێتی ی ئیسماعیل کردووە و فەرموویە:
{{وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِسْمَاعِيلَ إِنَّهُ كَانَ صَادِقَ الْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا ﴿٥٤﴾ وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُ بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِ مَرْضِيًّا ﴿٥٥﴾}}. مریـــم.
واتە: (هەروەها) لە قورئاندا باسی ئیسماعیل بکە، بەڕاستی ئەو لە بەڵێن و پەیمانەکانیدا ڕاستگۆ بوو، ئەو پێغەمبەرو ڕەوانە کراوی خودا بوو.
(ئیسماعیل) هەمیشە بەردەوام، فەرمانی دەدا بە خێزانی و خزمانی، کە نوێژەکانیان (بەڕیک و پێکی و لەکاتی خۆیدا) ئەنجام بدەن و زەکاتیش فەرامۆش نەکەن و ئەو لای پەروەردگاری شایستەی ڕێزو ڕەزامەندی بوو خەونەکەی ئیبراهیم (علیه السلام) و قوربانیدان بە ئیسماعیل خودای گەورە دەفەرموێ:

{{وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَى رَبِّي سَيَهْدِينِ ﴿٩٩﴾ رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ ﴿١٠٠﴾ فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ السَّعْيَ قَالَ يَا بُنَيَّ إِنِّي أَرَى فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانظُرْ مَاذَا تَرَى قَالَ يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ سَتَجِدُنِي إِن شَاء اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ ﴿١٠٢﴾ فَلَمَّا أَسْلَمَا وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ ﴿١٠٣﴾ وَنَادَيْنَاهُ أَنْ يَا إِبْرَاهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ هَذَا لَهُوَ الْبَلَاء الْمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ وَفَدَيْنَاهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ﴿١٠٧﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ ﴿١٠٨﴾ سَلَامٌ عَلَى إِبْرَاهِيمَ ﴿١٠٩﴾ كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴿١١٠﴾ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ ﴿١١١﴾ وَبَشَّرْنَاهُ بِإِسْحَقَ نَبِيًّا مِّنَ الصَّالِحِينَ ﴿١١٢﴾ }}. ألصّافّات.

واته: (ئینجا ئیبراهیم گوتی): من ئێوه بەجێ دەهێڵم و دەڕۆم بەرەو ڕەزامەندی پەروەردگارم، لە ئاییندەشدا بەردەوام ڕێنموویم دەکات. (ئەوسا کۆچی کرد)، لە خودا پاڕایەوە و گوتی: خودایە نەوەیەکی چاک و پاکم پێ ببەخشە. ئێمەش مژدەی کوڕێکی بە ئارام و خۆگر و ژیرمان پێبەخشی (کە ئیسماعیل)ـە. کاتێک ئەو کوڕە پێ دەگات و گەشە دەکات و (دەچێتە ئەو تەمەنەوەی کە دەتوانێت خۆی هەوڵ بدات و توانای کارکردنی هەبێت)! ئیبراهیم پێی گوت: کوڕم؛ من لە خەومدا

دەبینم کە تۆ سەردەبڕم! تۆ دەڵێی چی؟ ڕات چۆنە؟! گوتی: بابە؛ هەر فەرمانێکت پی دراوە جێبەجێی بکە، دەمبینیت ئەگەر خودا بیەوێت، لە ئارامگران دەبم. کاتێک هەردووکیان تەسلیمی فەرمانی خودا بوون، ئیبراهیم کوڕەکەی بە ڕوودا دەخات! ئێمەش بانگمان لێکرد: ئەی ئیبراهیم خەوەکەت هێنایە دی، ئێمە هەر ئاوا پاداشتی چاکەکەران دەدەینەوە. بەڕاستی ئەمە خۆی تاقیکردنەوەیەکی ئاشکرا و ڕوونە. ئێمەش قۆچێکی گەورەمان کردە قوربانی (ئیسماعیل). پاشان ئێمە لە ناو گەلان و نەوەکانی داهاتوودا ناوی ئیبراهیمان هێشتەوە. سڵاو و دروود لەسەر ئیبراهیم. ئێمە بەو شێوەیە پاداشتی چاکەکەران دەدەینەوە. بەڕاستی ئەویش لە بەندە ئیماندارەکانی ئێمەیە. مژدەی هاتنە دنیای ـ ئیسحاق ـ یشمان پێبەخشی، کە ئەویش پێغەمبەرێکە لە چاکەکان.

ئیبراهیم (علیه السلام) کە هیجرەتی کرد و قەومەکەی بەجێهێشت، داوای لە خودای گەورە کرد کە نەوەیەکی (صالح)ی پێبدات، خودای گەورەش داواکاری یەکەی پەسند دەکات و کوڕێکی هێمن (غُلامٌ حَلیم)ی(٥) پێدەبەخشێت کە (ئیسماعیل)ـە و یەکەم کوڕیەتی و لەتەمەنی (٨٦)ساڵیدا خودا پێی دەبەخشی.

ئەوجا لەگەڵ (هاجەر)ی دایکی دەیانبا لەو دەشتە وشکە و بێ ئاوییەی (مەککە) بەجێیان دەهێڵێت و خۆی دەگەڕێتەوە.
ئیبراهیم (علیه السلام) لەو ماوەی ژیانیدا چەندین جار سەردانی مەککەی کردووە. یەکێک لەو سەردانانەی کاتیک بوو کە کوڕە تاقانەکەی بوو بە (لاو) و چووە ئەو تەمەنەوەی کە توانای کەرکردنی هەبێت! ئیبراهیم (علیه السلام) خەونی دیت لە خەونەکەیدا دیتی کە کوڕە تاقانەکەی سەردەبڕێت(٦). ئیبراهیم (علیه السلام) مەسەلەکە دەخاتە بەرچاوی ئیسماعیل تاکو ئەم کارە لەبەر دڵیدا لەبارت رو ئاسان تریش بێت لەوەی کە بەزۆر سەری ببڕێت! و پێی دەڵێ: کوڕی خۆم من لەخەودا پێیان گوتم تۆ بکەم بە قوربانی، بزانم تۆ دەڵێی چی؟ ڕات چۆنە؟ گوتی: بابە گیان ئەوەی فەرمانت پێ کراوە جێ بەجێی بکە، پشت بەخودا دەمبینیت لە ئارامگران دەبم....
باوکەکە دەزانێت خەونی پێغەمبەران سروش (وەحی) خودایە...کوڕەکە دەزانێت خەونی پێغەمبەران (وەحی)یە... باوکەکە نایەت لەخودا بپاڕێتەوە ئەو ئەرکە گرانەی لەسەر لاببات بەڵکو دەستبەجێ دەیەوێ فەرمانەکەی پەروەردگاری جێبەجێ بکات...یاخود باوکەکە نایەت (تەئویل)

بکات و بڵێت: ئەی بو ڕاستەوخۆ پێم
نەگوتراوە!!....باوکەکە خۆی ناخاتە درەنگ و
سبەینێ یا ڕۆژێکی دی بەڵکو زوو بەدەم
فەرمانەکەی پەروەردگاریدا رۆیشتووە...کوڕەکەش
نایەت ناڕەزایی دەربڕێت، خۆی ناشارێتەوە بەڵکو
زۆر بەئەدەبەوە گوێ ڕایەڵی باوکی دەبێت و
ئامادەیی خۆی پیشان دەدات...
کە هەردووکیان خۆیان دەدەنە دەست فەرمان و
بڕیاری خودا و بەتەمای ڕاپەڕاندنی ئەمری خودا
دەبن، ئیبراهیم ئیسماعیلی بە ڕوودا خستە سەر
خاک (واتە دەم و چاوی دەخاتە سەر زەوی و بە
سکدا دەیخات) تاکو لە پشتەوە سەری ببڕێت و
ڕوخساری کوڕەکەی لە حاڵەتی سەربڕیندا
نەبینێت، ئەوجا چەقۆکە بە ملیدا دێنێت بەڵام
نایبڕیت (واتە جەقۆکە نایبڕێت). لە دواوە
بانگێکی لێکرا: ئەی ئیبراهیم (دەست هەڵگرە لە
سەربڕینی کوڕەکەت چونکە مەبەستی
تاقیکردنەوەتمان دەست کەوت و لێمان ڕادییت کە
گوێڕایەڵیت و فەرمانی خودای خۆت بە چاکی
ڕادەپەڕێنیت)، ئەمە ئەو تاقیکردنەوە گەورە و
دیار و ڕۆشنە بوو کە باوەڕ و ئیمانی تۆمان پێ
هەڵسەنگاند و (تۆش تیایدا سەرکەوتوو بویت)،

جا لە بریتی کوڕەکەت ئەم بەرانەی بۆمان داناویت (سەرببڕە و بیکە بە قوربانی کوڕەکەت). کە ئاوەڕیان دایەوە بەرانێکی شاخداری گەورە لە دوایانەوە ڕاوەستابوو [١٧]، پاشان چوون لە (مینا) سەریان بڕی [١٨]. تێبینی یەک:
جوولەکەکان لە بەر حەسودی ئیددیعای ئەوە دەکەن کە سەربڕاوەکە (ئیسحاق)ی کوڕی ئیبراهیمە، چونکە لەکتێبەکەی ئەوان (سفر التكوين) بەو شێوەیە نوسراوە گوایەخودای گەورە بە (ئیبراهیم)ی فەرمووبێت: (کوڕە تاقانەکەی خۆت کە خۆشت دەوێت و (ئیسحاقە) لەگەڵ خۆتدا ببە بۆ خاکی ـ موریە ـ ). ئیمام إبن کثیر ـ ڕەحمەتی خودای لێ بێت ـ لە وەڵامی ئەو ئیدیعایەی جوولەکەکاندا گوتوویەتی: (لەو ئیددیعایەیاندا بێژە (لفظ)ی ـ ئیسحاق ـ بەنابەجێ دانراوە، چونکە ـ ئیسحاق ـ کوڕی تاقانەو کوری یەکەم نەبووە، بەڵکو ـ ئیسماعیل ـ بووە، بەڵام جوولەکەکان ئەوەیان بە پێچەوانەوە باس کردووە لەبەر ئێرەیی (حەسوودی) بردنیان بە ـ عەرەب ـ، لەبەر ئەوەی ئیسماعیل باوکی ئەو عەرەبانەیە کە لە (حیجاز)دا نیشتەجێ بوون و یەکێک لەوانیش (محمد ـ ی پێغەمبەری خودایە)، (ئیسحاق)یش باوکی ـ یەعقووبە ـ واتە

(ئیسرائیل) کە جوولەکەکان لە ڕەچەڵەکی ئەون و ویستوویانە ئەو پلە و پایەیە بۆخۆیان بێت، بەم ڕەنگەش دەستکاریی ی (٧) فەرمایشتی خودایان کردووە و بۆیان زیاد کردووە [١٩].
هاوسەرەکەی ئیسماعیل دوای ماوەیەک (هاجەر) وەفات دەکات. ڕۆژێکیان ئیبراهیم (علیە السلام) دێت بۆ مەککە بۆ سەردانی ماڵی ئیسماعیلی کوڕی، تەنها بووکەکەی لەماڵەوە دەبێت و ئەویش ئیبراهیم (علیە السلام) ناناسێت چونکە نەی دیتبوو. ئیبراهیم (علیە السلام) هەواڵی ئیسماعیلی لێ پرسی، ئەویش لەوەڵامدا پێی ڕاگەیاند مێردەکەی چووە بۆ ڕاو، پاشان لە حاڵ و بارودۆخی گوزەرانیانی پرسی، ئەویش لەوەڵامدا گوتی: زۆر دەست کورت و نەدارین، ئیدی زۆری لەو قسانەی کرد. ئیبراهیم (علیە السلام) پێی گوت: ئەگەر مێردەکەت هاتەوە سەلامی لێ بکە و پێی بڵێ: با لاشیپانی دەرگەکەی بگۆڕێت(٣).
دوای ئەوەی کە ئیبراهیم (علیە السلام) ڕۆیشت، ئیسماعیل هاتەوە. وەک هەستی شتیکی کردبێت، لە هاوسەرەکەی پرسی: ئەمڕۆ کەس هاتووە بۆ لاتان؟! ئەویش لە وەڵامدا گوتی: بەڵێ، پیاوێکی پیری لەم حاڵە و لەم ڕەنگە پرسیاری تۆی لێ کردم

و منیش وەڵامم دایەوە، پاشان پرسیاری حاڵ و گوزەرانمانی کرد، منیش گوتم لە ناڕەحەتی و سەغلەتیداین. ئیسماعیل پرسیاری کرد و گوتی: ئەی باشە هیچ ڕاسپاردەیەکی پێ نەگوتی؟! گوتی: بەڵێ، پێی گوتم سەلامی لێ بکە و پێی بڵێ: لاشیپانی دەرگەکەی بگوڕێت. ئیسماعیل گوتی: ئەوە باوکم بووە، فەرمانی پێ کردووم لێت جیاببمەوە،کەواتە تۆش بڕۆ بۆ ماڵی باوکت!!... بەو ڕەنگە تەڵاقی داو هەر لەم هۆزە ژنێکی دیکەی هێنا.

پاش ماوەیەکی دی ئیبراهیم (علیه السلام) سەردانی کردەوە، ئەم جارەشیان ئیسماعیل لە ماڵ نەبوو، ئیبراهیم (علیه السلام) هەواڵی ئیسماعیلیلە هاوسەرەکەی پرسی ئەویش لە وەڵامدا پێی ڕاگەیاند مێردەکەی چووە بۆ ڕاو! ئینجا پرسیاری دەربارەی بارودۆخی ژیان و گوزەرانیانی لێ کرد. ئەویش گوتی: سوپاس بۆ خودا زۆر باشین، گوزەرانمان چاکە، سوپاس و ستایشی زۆری خوداشی لەلا کرد. ئەوجا پرسیاری جۆری خواردنیانی لێ کرد. ئەویش لەوەڵامدا گوتی: گۆشت! ئیبراهیم (علیه السلام) پرسی: ئەی خواردنەوەتان؟! وەڵامی دایەوە و گوتی: ئاو!

ئیبراهیم فەرمووی: (أللهُمَّ بارِكْ لَهُم في اللَّحْمِ والْماءِ)، واتە: خودایە بەرەکەتیان بۆ بخەیتە گۆشت و ئاوەوە(٤)....پاشان فەرمووی ئەگەر مێردەکەت هاتەوە سەلامی لێ بکە و پێی بڵێ: (لاشیپانی دەرگەکەی جێگیرکا و بیهێڵێتەوە).
کاتێک ئیسماعیل گەڕایەوە ماڵەوە، بە هاوسەرەکەی گوت: کەس سەردانی کردوون؟ گوتی: بەڵێ! پیاوێکی بە تەمەنی ڕوخسار جوانی نورانی، پرسیاری تۆی کرد، منیش وەڵامم دایەوە، پاشان پرسیاری حاڵ و گوزەرانمانی کرد، منیش گوتم: باشین! ئیسماعیل گوتی: هیچ ڕاسپاردەی پێ نەگوتی؟ گوتی: بەڵێ! پێی گوتم سەلامی لێ بکە و پێی بڵێ:(لاشیپانی دەرگەکەی چێگیرکا و بیهێڵیتەوە)! ئیسماعیل گوتی ئەوە باوکم بووە! لاشیپانی دەرگەکەش تۆی! فەرمانی پێ کردووم دەستت لێ بەرنەدەم.
باسی لەدایک بوونی گەورەمان ئیسحاق
خودای گەورە دەفەرموێ:
{{وَبَشَّرْنَاهُ بِإِسْحَقَ نَبِيًّا مِّنَ الصَّالِحِينَ ۞{١١٢} وَبَارَكْنَا عَلَيْهِ وَعَلَى إِسْحَقَ وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحْسِنٌ وَظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ مُبِينٌ ۞{١١٣}}}. الصّافّات.

واتە: مژدەی هاتنی دنیای ـ ئیسحاق ـ یشمان پێبەخشی، کە ئەویش پێغەمبەرێکە لە چاکان. خێر و بەرەکەتمان ڕژاند بەسەر ئیبراهیم و بەسەر ئیسحاقدا و لە نەوەی هەردووکیان واتە: (ئیسماعیل و ئیسحاق) چاکان و پاکان، هەروەها ئەو کەسانەش پەیدا دەبن بە ڕوونی ستەم لە خۆیان دەکەن. ڕۆژێک لەڕۆژان چەند فریشتەیەک لەسەر شێوەی مرۆڤ هاتن بۆ ماڵی ئیبراهیم (علیە السلام) لە (فەلەستین) و بوون بە میوانی. ئەویش وەک عادەتی میوانداری گایەکی قەڵەوی بۆ سەربڕین، کاتێک خواردنەکە ئامادە کرا، دیتی میوانەکان دەست بۆ خواردنەکە ڕاناکێشن و نایخۆن، لەبەر ئەوە ئیبراهیم زۆر ترسا چونکە عادەت وابوو هەر میوانێک لە خواردنی خانەخوێی نەخواردایە، مەبەست وابوو نیازی خراپیان هەیە. (بۆ نموونە لە کوردەواریشدا وا باوە هەر کەسێک خواردنی ماڵێکی خواردبێ، دەڵێ: نمەکم کردوون و قەد زیان بەو ماڵە و خەڵکی ماڵەکە ناگەیەنێت).
خودای گەورە دەفەرموێ:
{{وَلَقَدْ جَاءتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَى قَالُواْ سَلاَمًا قَالَ سَلاَمٌ فَمَا لَبِثَ أَن جَاء بِعِجْلٍ حَنِيذٍ ﴿٦٩﴾ فَلَمَّا

رَأَى أَيْدِيَهُمْ لاَ تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُواْ لاَ تَخَفْ إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَى قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٠﴾ وَامْرَأَتُهُ قَآئِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَقَ وَمِن وَرَاء إِسْحَقَ يَعْقُوبَ ﴿٧١﴾ قَالَتْ يَا وَيْلَتَى أَأَلِدُ وَأَنَاْ عَجُوزٌ وَهَذَا بَعْلِي شَيْخًا إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عَجِيبٌ ﴿٧٢﴾ قَالُواْ أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ اللّهِ رَحْمَتُ اللّهِ وَبَرَكَاتُهُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الْبَيْتِ إِنَّهُ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ ﴿٧٣﴾ فَلَمَّا ذَهَبَ عَنْ إِبْرَاهِيمَ الرَّوْعُ وَجَاءتْهُ الْبُشْرَى يُجَادِلُنَا فِي قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّاهٌ مُّنِيبٌ ﴿٧٥﴾}. هود.

واتاو شیکاری ئایەتەکان: بێگومان وەفدێکی ڕەوانە کراوی ئێمە (لە چەند فریشتەیەک پێک هاتبوو) هاتن بۆ ماڵی ئیبراهیم بە مژدەوە (مژدەی بوونی منداڵێک) و گوتیان: سەلامی خودات لێبێت، ئەویش گوتی: سەلامی خودا لە ئێوەش، دوای بەخێرهاتنیان ڕۆیشت و جا زۆری پێ نەچوو گەڕایەوە بە گۆشتی گۆلکێکی برژاوەوە. جا کاتێک ئیبراهیم دیتی دەستی بۆ نابەن، کارەکەیانی بە نائاسایی داناو لەدڵی خۆیدا لێیان ترسا.

فریشتەکان کاتێک زانیان خۆفێک بە سەر دڵی (ئیبراهیم) دا هاتووە گوتیان مەترسە، ئێمە فریشتە و نێردراوی خوداین، بۆ ئەوە هاتووین تا

گەلی (لوط) لەناو بەرین ــ لە چیرۆکی لوط (علیه السلام)دا بە درێژی باس لە ناوچوونی قەومەکەی دەکەین ـ. لەو کاتەداخێزانەکەی (سارا) وەستابوو، یەکسەر پێکەنی (کە زانی میوانەکان فریشتەن و نێردراوی خودای گەورەن، هەروەها دڵیشی بەوە خۆش بوو کە مژدەی لە ناوچوونی گەلی خراپەکاری ـ سەدووم ـ یشیان هێناوە). جا (خودای گەورە فەرمووی): ئێمەش مژدەمان دایە کە (ئیسحاق)ت پێدەبەخشین و لەدوای ئەویش یەعقوب (لەنەوەی ئیسحاق دێتە دنیاوە).

خێزانی ئیبراهیم گوتی: (شەرمەزارخۆم)! چۆن منداڵم دەبێت من پیرم و ئەوەش مێردەکەمە، پیر و بەساڵا چووە، بەڕاستی شتێکی سەر سوڕهێنەرە!! فریشتەکان گوتیان: ئایا سەرسام دەبیت لە فەرمان و کاری خودا؟ دەی بزانن ڕەحمەت و بەرەکەتی خودا لە سەر ئێوەیە، ئەی خێزانی ئەم ماڵە پیرۆزە، (بێگومان خودای گەورە کاری وا دەکات) و چونکە هەمیشە سوپاسکراوە و خاوەنی دەرچوو (هێمن بۆوە) و مژدەکەشی بۆ هاتبوو، کەوتە موجادەلە لەگەڵ فریشتەکان، دەربارەی گەلی (لوط). بەڕاستی ئیبراهیم زۆر لەسەر خۆو بە ئارام و خەمخۆر و گەڕاوەیە بۆ لای خودا.

## دروست کردنی کەعبەی پیرۆز

خودای گەورە دەفەرمویٚ:
{{وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَاهِيمَ مَكَانَ الْبَيْتِ أَن لَّا تُشْرِكْ بِي شَيْئًا وَطَهِّرْ بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْقَائِمِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ ﴿٢٦﴾ وَأَذِّن فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ﴿٢٧﴾}}.
ألحج.
واتە: کاتیک شوێنی کەعبەمان دیاری کرد بۆ ئیبراهیم (دوای تەواوبوونی، فەرمانمان پێدا) کە هیچ جۆرە هاوەڵێکم بۆ بڕیار نەدەیت و (بیکە بە بنکەی یەکخواناسی) و ماڵی من (واتە کەعبە) پاک بکەرەوە بۆ ئەوانەی بەدەوریدا دەسوڕینەوە، یاخود بە پێوەن یا لە کرنووش و سوجدە بردندان. جا بانگی خەلکی بکە و جاڕ بدە لە ناویاندا با بێن بۆ حەج، ئەوانیش بە پیادە دێن بەدەم بانگەوازەکەتەوە، یان بە سواری (ئەو حوشترانەی کە دووری ماوەکە) لاوازی کردوون و لە هەموو ڕێگەیەکی دوورەوە هەر دێن.
خودای گەورە فەرمانی کرد بە ئیبراهیم (علیه السلام) بچێت خانوویەک بۆ عیبادەت و خودا پەرستی لە مەککە دروست بکات، تاکو ببێتە یەکەمین ماڵ بۆ خودا پەرستی. ئیبراهیم و - ئیسماعیل - کوڕی (سەلامی خودایان لێبیت) بەڕێ

کەوتن بۆ ئەنجام دانی کارەکە، خودای گەورەش ڕێنمایی کردن بۆ جێگەکەی کە لەو شوێنەدا دروستی بکەن(٨).
کوڕ و باوک پێکەوە کەوتنە دروست کردنی بینای کەعبەی پیرۆز، لەکاتی ئیش کردندا لە بەرخۆیانەوە زیکر و وێرد و دوعایان دەکرد لەو دوعایانە: {{وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ إِنَّكَ أَنتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾ رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنتَ العَزِيزُ الحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾ }}. ألبقرة.
واتە: ئەو کاتەی ئیبراهیم پایەکانی کەعبەی بەرز دەکردەوە لەگەڵ ئیسماعیلدا و (دەیانگوت): ئەی خودای پەروەردگارمان! ئەم کارەمان لێ وەربگرە و لەڕیزی چاکەکانماندا تۆماری بکە، چونکە هەر تۆ بیسەر و زانایت. ئەی خودای پەروەردگارمان هەردووکمان وا لێ بکە تەنها فەرمانبەردار و ملکەچی تۆ بین و لە نەوەکانیشمان ئوممەتێکی مسوڵمان و فەرمانبەردار بۆ خۆت فەراهەم بهێنە و چۆنیەتی ڕێبازی بەندایەتیمان فێربکە و نیشانمان بدە و تەوبە و پەشیمانیمان لێ وەربگرە،

بێگومان تۆ زۆر تەوبە وەرگر و میهرەبان و دلۆڤانیت. ئەی خودای پەروەردگارمان! بۆ ئەو خەڵکەی کە لەئایندەدا دێن (لە نێو ئەو وەچەو نەوانەماندا) پێغەمبەرێک لەخۆیان ڕەوانە بکە (کە ئەویش پێغەمبەری خودا محمـــــد بوو)(٩)، تاکو ئەو ئایەت و بەڵگەو نیشانانەیان (دەربارەی بوون و تاک و تەنیایی تۆ و گەورەیی شان و شەوکەتی تۆ) یان بۆ بخوێنێتەوە، فێری کتیبە پیرۆزەکەی تۆ (واتە قورئان) و داناییان بکات، تا دڵ و دەروونیان لە هەموو داب و نەریتێکی خراپ و گشت سیفەتێکی ناپەسند پاک بکاتەوە، بەڕاستی هەر تۆ باڵادەست و دانایت.
ئیبراهیم دەستی کرد بە دروست کردنی دیوارەکانی (کەعبە) و ـ ئیسماعیل ـ ی کوڕیشی بەردی دەدایە دەست، کاتێک دیوارەکە بەرز بۆوە ئیبراهیم نەیدەتوانی بەرد بەرز بکاتەوە بەڵکو چووە سەر بەردێک کە بە (مەقامی ئیبراهیم) ناو دەبرێت [٢٠]، ئیدی هەر کە لایەکی دیوارەکەی تەواو دەکرد ئەو بەردەی ژێر پێ ی دەگواستەوە بۆ تەواو کردنی لایەکی دیکە و لەسەری دەوەستا، تا گەیشتنە ئاستێک ئیبراهیم بە ئیسماعیل (علیه السلام)ی گوت: بەردێکی باشم بۆ ئەم جێگەیە بۆ

بهێنه، ئیسماعیل درەنگ هاتەوە، کە هاتەوە دیتی ئەو جێگەیە ئەو چوبو بەردی بۆ بێنێ بەردێکی ڕەشی زۆر چاکی لێ داندراوە، گوتی ئەوە کێ ئەو بەردەی هێنا؟ ئیبراهیم (علیه السلام) فەرمووی کەسێک لە تۆ چوست و چالاک تر [٢١]، پاشان خەریک بوون تا هەموو دیوارەکانیان تەواو کرد.

قورئانی پیرۆزیش ئاماژە بۆ کاری دروست کردنی کەعبەی پیرۆز دەکات لەم ئایەتانەدا:
{{وَإِذْ جَعَلْنَا الْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْناً وَاتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى وَعَهِدْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ ﴿١٢٥﴾ وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَذَا بَلَدًا آمِنًا وَارْزُقْ أَهْلَهُ مِنَ الثَّمَرَاتِ مَنْ آمَنَ مِنْهُم بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُ قَلِيلاً ثُمَّ أَضْطَرُّهُ إِلَى عَذَابِ النَّارِ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿١٢٦﴾ وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾. ألبقرة.
واتە: (یادی ئەوەش بکەنەوە "خودای گەورە ئەو نیعمەتە دەخاتەوە یادی عەرەبە مسوڵمانەکان")، چۆن ئەمماڵەمان (کەعبە) کردە جێگای

کۆبوونەوەی خەلکی، کە بەوپەڕی هێمنی و ئاسایش و ئاسوودەییەوە لەوێ بەیەک بگەن (دە ئێوەش خەڵکینە) مەقامی ئیبراهیم کە شوێنی تایبەتی خوداپەرستی ئەو بوو، بیکەنە جێگەی خوداپەرستی و نوێژ، ئینجا فەرمانماندا بە ئیبراهیم و ئیسماعیل کە ئەوماڵەم خاوێن بکەنەوە (لە چەپەڵی ماددی وەک بەدکرداری و بەدخوویی، هەروەها لەچەپەڵی مەعنەوی وەک هاوەڵ بۆ خودادانان "شرک" و بتپەرستی) بۆ تەواف کاران (ئەوانەی بەدەوریدا دەسوڕێنەوە) و بۆ ئەوانەی (اعتکاف) دەکەن، هەروەها بۆ کڕنووشبەران و سوجدەبەران.

(یادی ئەوە بکەنەوە) کاتێک ئیبراهیم دوعای کرد و گوتی: ئەی خودای پەروەردگار: دەورووبەری ئەم ماڵەت بگێڕە بە شارێکی پڕ لە ئاسایش و دانیشتوانەکەشی کە باوەڕیان بە خودا و ڕۆژی دوایی هێناوە بەهرەمەندکە لە ڕزق و ڕۆزیی.

(خودای گەورەش نزاکەی گیراکرد) و فەرمووی: تەنانەت ئەوەش کافرە بێ بەش ناکەم لە بەرهەم و ناز و نیعمەتی کەم تەمەنی ئەم دنیایە، بەڵام لە ڕۆژی قیامەتدا دەیانخەمە بەر سزای دۆزەخ و دژوارترین چارەسەر. (بەیاد بهێنن) ئەو کاتەی ئیبراهیم پایەکانی کەعبەی بەرز دەکردەوە لەگەڵ

ئیسماعیلدا و (دەیانگوت): ئەی خودای پەروەردگارمان ئەم کارەمان لێ وەربگرە و لەڕیزی چاکەکەنماندا تۆماری بکە، چونکە هەر تۆ بیسەر و زانایت.
بەڵـــێ.....خودای گەورە نزاکەی ـ ئیبراهیم ـ ی گیراکرد و داواکاری یەکەی بەجێ گەیاند و شاری ـ مەککە ـ ی کردە وڵاتیکی ئارام و هێمن و هەر کەسێک ویستبێتی دەستدرێژی بکاتە سەر، خودای گەورە لەناوی بردووە، هەروەها ئەو نزایەشێ گیراکرد دەربارەی بەخشینی ڕزق و ڕۆزی یەکی زۆر بە دانیشتوانەکەی....
توانای خودای مەزن لەسەر زیندوو کردنەوەی مردوان خودای گەورە توانای بەسەر هەموو شتێک لە گەردووندا هەیەو هیچ شتێکی لەلا گران و ئاسەنگ نی یە، چونکە وەک چۆن مرۆڤی لەسەرەتادا خەلق کردووە تواناشی لەسەر زیندووکردنەوەی بۆ ڕۆژی قیامەت هەیە، وەڵامێکی قورئان بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بەڕۆژی دوایی نی یە، یا ئەو کەسانەی کە دوودڵن و گومانیان هەیە کە بەدی هاتنی ڕۆژی دوایی (أليوم ألآخر) بە دوور دادەنێن و گوایە خودا لەوە دەستەوسانە. وەڵامێکی قورئان بۆ ئەو جۆرە کەسانە لە وەسف کردنی قودرەتی خودا ئەوەیە:

{{أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَى قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَى عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىَ يُحْيِي هَذِهِ اللّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا فَأَمَاتَهُ اللّهُ مِئَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِئَةَ عَامٍ فَانظُرْ إِلَى طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ وَانظُرْ إِلَى حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ آيَةً لِّلنَّاسِ وَانظُرْ إِلَى العِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ اللّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٥٩﴾}} . ألبقرة.

واتە: یاخود وەک ئەو کەسەی تێپەڕی بەلای شارۆچکەیەکدا کە هەموو خانووەکانی بەسەر سەقفەکانیدا تەپی بوون، لەبەر خۆیەوە گوتی: ئاخۆ خودای گەورە چۆن خەڵکی ئەم شارۆچکەیە دوای مردنیان زیندوو دەکاتەوە؟! (ئەو کەسە عوزەیر پێغەمبەر بوو)، یەکسەر خودای گەورە سەد ساڵ مراندی و پاشان زیندووی کردەوە و پێی فەرموو: چەند مایتەوە؟ (عوزەیر) گوتی: ڕۆژێک یا کەمتر لە ڕۆژێک ماومەتەوە، (خودا) فەرمووی: نەخێر ئەوە سەد ساڵت پێچووە، جا تەماشای خواردن و خواردنەوەکەت بکە (لەو ماوە درێژەدا) نەگۆڕاوە و تێک نەچووە، تەماشای گوێدرێژەکەشت بکە؛ (بۆیە ئەوەمان کرد) تا بەم بەسەرهاتە بتکەینە موعجیزە بۆ خەڵکی، جا تەماشای ئێسکەکانی (گوێدرێژەکەت) بکە، چۆن

بەرزیان دەکەینەوە و بەیەکەوەیان دەبەستین و پاشان بە گۆشت دایاندەپۆشین، کاتێک دیتی و بۆی دەرکەوت گوتی: چاک دەزانم و دڵنیام بەڕاستی خودا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە..
ئیبراهیمیش (علیه السلام) هەرچەند باوەڕی هەبوو بەتوانای خودا لەسەر زیندووکردنەوەی مردوان لەرۆژی دواییدا، بەڵام داوای نموو نەیەکی بەرچاوو هەست پێکراوی لەو بارەیەوە لە خودای پەروەردگار کرد تاکو ئارامی و دڵنیایی لە دەروونیدا بچەسپێن، خودای گەورەش ئەو داوایەی بۆ بەجێ هێناو توانای خۆی پێشان دا، هەروەک قورئانیش بەم جۆرە بۆمان دەگێڕیتەوە:
وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَى وَلَكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ الطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ اجْعَلْ عَلَى كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ادْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا وَاعْلَمْ أَنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦٠﴾ }}. ألبقرة.
واتە: هەروەها ـ ئیبراهیم ـ داواکاری یەکی لە خودا هەبوو و گوتی: خودایە پێشانم بدە چۆن مردوو زیندوو دەکەیتەوە؟ خودا فەرمووی: ئەی مەگەر باوەڕت بەوە نەهێناوە؟ ئەویش گوتی. بەڵێ!
(چۆن باوەرم نەهێناوە) بەڵام حەز دەکەم

(بەچاوی خۆم ببینم) تا دلم ئارام بگرێت، (خودای گەورەش بۆ وەڵامی داواکەی) پێ ی فەرمووو: دە کەواتە چوار باڵندە بێنە و پارچە پارچەیان بکەو هەر بەشێک لەو پارچانەش بخەرە سەر چیایەک، ئەوجا بانگیان بکە، دەبینیت بە خێرایی هەموویان دێنەوە بۆلات و (زیندوو بوونەتەوە). بەم ڕەنگەش بزانە خودا باڵادەست و دانایە.

ئەگەر بەوردی سەرنج لەم فەرمایشتەی خودای گەورە بدەین بۆمان دەردەکەوێت کەوا (ئیبراهیم) هیچ گومانێکی لە (باوەڕ بە قودرەتی خودا و زیندووکردنەوەی مردوان بۆ ڕۆژی دوایی) نیە، بەڵکو بۆ دڵنیایی ئەم داوایەی لە خودا کردووە چونکە ئەگەر گومانی هەبوایە لەم مەسەلەیەدا داواکارییەکەی بەم جۆرە دەبوو: (ئایا مردووان زیندوو دەکەیتەوە؟: هل تحیی الموتی؟) نەک (چۆن مردوان زیندوو دەکەیتەوە... کیف تحیی الموتی). پرسیارەکەشی وەک پرسیاری ئەو مرۆڤەیە کە دەیەوێت دڵارام و دامەزراو بێت و بوارێک بۆ گومان و ڕارایی نێو دەروونیدا نەهێلێتەوە.

به شی چواره می ژیاننامه ی ابراهیم علیه سلام
یه که م ماڵێکه که بۆ هەموو خەڵکی داندرابێت
پەرستشەکانی لێ بکەن، وەک (نوێژ، مانەوە لە
مزگەوتدا (إعتكاف)، تەواف، حەج): {{إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ
وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ
۝{٩٦}}} . آل عمران. • پێغەمبەران (ئیبراهیم و
ئیسماعیل) بنیاتیان ناوە: {{وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ
الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنتَ
السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ۝{١٢٧}}} . ألبقرة.
• ماڵێکی پیرۆزە و ڕێز لێ گیراوە: {{ مُبَارَكًا }} . .
آل عمران۝{٩٦}. • بۆ ڕێنمایی کردنی گشت خەڵکی
یە: {{ وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ }} . . آل عمران۝{٩٦}. •
حەرەمیکی موحەڕرەمە، پڕ ئەمن و ئاسایشە:
{{ وَمَن دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا }} .آل عمران۝{٩٧}. {{أَوَلَمْ
يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا آمِنًا وَيُتَخَطَّفُ النَّاسُ مِنْ
حَوْلِهِمْ أَفَبِالْبَاطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَكْفُرُونَ
۝{٦٧}}}. ألعنكبوت. {{أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا آمِنًا
يُجْبَى إِلَيْهِ ثَمَرَاتُ كُلِّ شَيْءٍ رِزْقًا مِن لَّدُنَّا وَلَكِنَّ
أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ۝{٥٧} }}. ألقصص.
ڕێزی ئیبراهیم (علیه السلام) خودای گەورە زۆر
ڕێزی لە ئیبراهیم (علیه السلام) ناوە چونکە دوای
ئەوەی کە خودای گەورە (بەچەند ڕاسپاردەیەکی
شەرعی و چەند فەرمانکارییەک بە چاکە و

بەربەستکارییەک لە خراپە) تاقیی کردۆتەوە ئەویش بەتەواوی هەمووی جێ بەجێ کردووە و مافی تەواوی تیدا گەیاندوون:
{{وَإِذِ ابْتَلَى إِبْرَاهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ فَأَتَمَّهُنَّ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِي قَالَ لاَ يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ۝﴿١٢٤﴾}}. ألبقرة.
پەروەردگاری ئیبراهیم، ئیبراهیمی تاقیکردەوە بە چەند فەرمان و بڕیارێک، ئەویش زۆر بە جوانی ئەنجامیدان، دوایی (کە لە هەموو تاقیکردنەوەکاندا سەرکەوت) خودا فەرمووی من بڕیارم داوە بتکەمە پێشەوای خەڵکی، ئیبراهیم گوتی: حەز دەکەم نەوەکانیشم لەو کارە پیرۆزە بێ بەهرە نەبن، خودا فەرمووی: پەیام و پەیمانی من بۆ ستەمکاران نابێت (با نەوەی تۆش بن):
• خودای گەورە کردوویەتی بە پێشەوای باوەڕداران و هەروەها چاوی لێ بکەن و پابەندی ڕێسا و سوننەتی بن و لەسەر شوێن پێی ئەو ڕێگە دەربکەن، وەک خودای گەورە دەفەرموێت ( قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ) ئیبراهیم پێغەمبەر گوتی : (قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِي )، خودای گەورە فەرمووی: (قَالَ لاَ يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ ).
"تەماشای ئایەتی سەرەوە بکە"..

• هەرچی پێغەمبەرێک لەدوای ئیبراهیم هاتووە، لە نەوەی ئەو بووە: {{وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِ النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ وَآتَيْنَاهُ أَجْرَهُ فِي الدُّنْيَا وَإِنَّهُ فِي الْآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ ﴿٢٧﴾ }}. ألعنكبوت.... {{وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ كُلاًّ هَدَيْنَا وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ وَمِن ذُرِّيَّتِهِ دَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَى وَهَارُونَ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴿٨٤﴾ وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَى وَعِيسَى وَإِلْيَاسَ كُلٌّ مِّنَ الصَّالِحِينَ ﴿٨٥﴾ وَإِسْمَاعِيلَ وَالْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا وَكُلاًّ فضَّلْنَا عَلَى الْعَالَمِينَ ﴿٨٦﴾ وَمِنْ آبَائِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ وَإِخْوَانِهِمْ وَاجْتَبَيْنَاهُمْ وَهَدَيْنَاهُمْ إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٨٧﴾ }}. ألأنعام. • لە دوای پێغەمبەری خودا محمد (عليه السلام) ئیبراهیم (عليه السلام) گەورەترین پێغەمبەرە، پێغەمبەر (عليه السلام) دەفەرموی: ((وأخرت الثالثة ليوم يرغب إلي الخلق كلهم حتى إبراهيم)). مسلم گێراویەتیەوە. واتە: دوعای سێهەمم هەڵگرتووە بۆ ڕۆژی قیامەت، ئەو کاتەی هەموو خەڵکی ئومێدیان پێمە هەتا ئیبراهیمیش.

• خودای گەورە ئەوەندە ڕێزی گرتووە و خۆشی ویستووە، بۆیە پلەوپایەی (ئیبراهیم)ی دیاری کردووە و دەفەرموێت: {{ وَاتَّخَذَ اللّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلاً ﴿١٢٥﴾}}. ألنساء.

واتە: خودا ئیبراهیمی بەتایبەتی هەڵبژاردووە و پاڵاوتوویەتی و کردوویەتی بە خۆشەویستی خۆی و ڕیزداری کردووە. پێغەمبەری خوداش (علیه السلام) دەفەرموێ: ((فإن الله إتخذني خليلا كما اتخذ ابراهيم خليلا)). مسلم. واتە: خودای گەورە منی کردووە بە خەلیلی خۆی هەروەک چۆن ئیبراهیمی کردووە بە خەلیلی خۆی.
هەروەها قورئانی پیرۆز هەندێک سیفەت و ڕەوشتە بەرزەکانی ئیبراهیم (علیه السلام)مان بۆ دیاری دەکات: • خودای گەورە فەرموویە: {{إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٠﴾ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ اجْتَبَاهُ وَهَدَاهُ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٢١﴾ وَآتَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَإِنَّهُ فِي الْآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ ﴿١٢٢﴾}}. ألنحل.
واتە: ئیبراهیم هەرخۆی ئوممەتێک (نەتەوەیەک) بوو (چونکە هەموو خاسیەت و نەریتە جوانەکانی تێدا کۆببوونەوە)، ملکەچ و فەرمانبەرداری خودا بوو لە هەموو بیر و باوەڕێکی چەوت بەدوور بوو و هیچ کەسی نەکردووە بە هاوبەش و هاوەڵی خودا...هەروەها زۆر سوپاسگوزاری خودا بوو لە بەرامبەر ناز و نیعمەتی بێ شوماری
پەروەردگاریەوە، ئەویش هەڵی بژاردو ڕێنموویی

کرد بۆ ڕێبازی ڕاست و دروست...ئێمە هەر لە دنیادا چاکەمان پێبەخشی و پاداشتی چاکەمان دایەوە و لەئاخیرەتیشدا لەڕیزی چاکاندایە (کە ڕێزدار و بەختەوەر و کامەرانن)...

• هەروەها خودای گەورە فەرموویە: {{وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ﴿٤١﴾}}. مريم. واتە: (ئەی محمد) باسی ئیبراهیم بۆ گەلەکەت بگێڕەوە، بەڕاستی ئەو کەسایەتیەکی ڕاستگۆ بوو، لە پێغەمبەرانیش بوو(١).

• هەروەها لە وەسفێکی دیکەی ئیبراهیم (علیه السلام) خودای گەورە فەرموویە: {{وَإِبْرَاهِيمَ الَّذِي وَفَّى ﴿٣٧﴾}}. ألنجم. واتە: یان ئەو ئیبراهیمەی کە هەموو پەیمانەکانی بەجێ هێنا بە تەواوی.

(هەموو خەسلەتێکی باوەڕ و لقەکانی تەواو کرد، هیچ فەرمانێکی گرنگ، فەرمانێکی سوپاسگوزاریی ی لە بیرنەدەبردەوە و هیچ کارێکی گەورەش لە کارێکی بچوکتری دانەدەبڕی).

دوعا و نزاکانی ئیبراهیم (علیه السلام)

قورئان هەندێک لەو نزایانەمان بۆ دەخاتە ڕوو کە لەسەر زاری ئیبراهیم (علیه السلام) هاتوون، ئەگەر سەرنجی ئەو نزایانە بدەین بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو پێغەمبەرە لای خودای گەورە

خۆشەویست بووە، چونکە لە نزاکانیتدا هیچ کات داوای کەرەسەیەک لە کەرەسەکانی دنیا ناکات، بەڵکو نزای ئەو نزای مرۆڤێکی باوەڕدارە کە خودای خۆی ناسیوە و ئیدی هەموو شتیکی دیکەی لەبەر چاو گچکە بووە. لەنزاکانی :
{{رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ ﴿٨٣﴾ وَاجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ ﴿٨٤﴾ وَاجْعَلْنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ النَّعِيمِ ﴿٨٥﴾ وَاغْفِرْ لِأَبِي إِنَّهُ كَانَ مِنَ الضَّالِّينَ ﴿٨٦﴾ وَلَا تُخْزِنِي يَوْمَ يُبْعَثُونَ ﴿٨٧﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾}}. ألشعراء.
واتە: خودایە زانیاری و دانایی و دەسەڵاتی تەواوم پێ ببەخشە و پەیوەستم بکە بە چاکەکارانەوە (٢). خودایە یادی خێرم با لەسەر زاری نەوەکانی داهاتوو بمێنیت. بمگێڕە لەو کەسانەش کە بەهەشتی پڕ لە ناز و نیعمەت بەدەست دەهێنن و دەبنە خاوەنی، لە باوکیشم خۆش ببە بەڕاستی ئەو لە ڕیزی گومڕاکاندا بوو(٣). لەڕۆژی زیندوو بوونەوەی ئەو خەڵکەدا شەرمەزارم مەکە. ئەو ڕۆژەی کە نە ماڵ سوود دەبەخشیت و (فریای ئادەمیزاد دەکەوێت) نە منداڵ و نەوە. مەگەر کەسێک بە دڵ و دەروونی پاک و بێگەرد و پڕ لە ئیمان، بە خزمەت پەروەردگار گەیشتبێت.

له نزاکانی ئیبراهیم (علیه السلام) و ئیسماعیل (علیه السلام) پێکەوە:
{{رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ إِنَّكَ أَنتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾ رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنتَ العَزِيزُ الحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾ }}. ألبقرة.
واتای ئایەتەکان: خودایە، هەردووکمان وا لێ بکە کە تەنها فەرمانبەردار و ملکەچی تۆ بین و لە نەوەکانیشمان ئوممەتێکی مسوڵمان و فەرمانبەردار بۆ خۆت فەراهەم بهێنە و چۆنیەتی ڕێبازی بەندایەتیمان فێرکە و نیشانمان بدە و تەوبە و پەشیمانیمان لێ وەربگرە، بێگومان تۆ خودایەکی زۆر تەوبە وەرگر و میهرەبان و دلۆڤانیت. ئەی خودای پەروەردگارمان، لە نێو ئەو وەچە و نەوانەماندا پێغەمبەرێک لەخۆیان ڕەوانە بکە، تائایەتەکانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوە و فێری کتێبە پیرۆزەکەی تۆ (واتە قورئانی پیرۆز) و داناییان فێر بکات، تا دڵ و دەروونیان لە ژەنگ و کردەوەیان لە ڕەوشتی ناپەسەند پاک بکەتەوە، بەڕاستی هەر تۆ خودایەکی باڵا دەست و دانایت(٤).

نزایەکی دی لە نزاکانی ئیبراهیم (علیه السلام):
{{رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا وَاغْفِرْ لَنَا رَبَّنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٥﴾}}. ألممتحنة.

{{إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٣١﴾ وَوَصَّى بِهَا إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَا بَنِيَّ إِنَّ اللّهَ اصْطَفَى لَكُمُ الدِّينَ فَلاَ تَمُوتُنَّ إَلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٣٢﴾ }}. ألبقرة.
ئیبراهیم (علیه السلام) کۆتایی ژیانی لە شاری (حبرون= الخلیل) بەسەر بردووە، هەر لەوێش وەفاتی کردوە. لەگەڵ (سارا)ی خێزانی، (ئیسحاق)ی کوڕی و (یەعقوب)ی کوڕەزای پێکەوە نێژراون لەو چوارگۆشەیەدا کە سولەیمانی کوڕی داود (سەلامیان لێ بێت) بۆی دروست کردون و نەوە لە دوای نەوە هەواڵەکە گەیشتوە بە ئێمە[٢٤].



کــــۆتـــــایـــــی